شیعر

# هەناسەکانی سپێدە

## هۆگر ڕەنجدەر

٢٠٠٨

ناوی نووسەر: هۆگر سوارە جەبار
کتاب: هەناسەکانی سپێدە
دیزاین: کاوە فاروق
چاپ: چاپخانەی شەهاب
تیراژ: ٥٠٠
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٠٧)
ساڵی (٢٠٠٨)ی پێی دراوە.

- پێشکەشە بە هەناسەکەم
- پێشکەشە بە بنەماڵەکەم (دایک وباوک و خوشک وبراکانم
- پێشکەشە بە خێزانەکەم ومناڵە چاو گەشەکانم
- پێشکەشە بە مام و ئامۆزاکانم
- پێشکەشە بە هەمو هاورێکانم بە تایبەتی (کاک شێروان)
- پێشکەشە بەو بەرێزانەی کە دەیخوێنەوە...
- پێشکەشە بەو بەرێزانەی کە یارمەییان دام بۆ چاپکردنی ئەم پەرتوکە
- بۆ هەر رەخنەو پێش نیارێک پەیوەندی بکە بە وئیمیلانەوە

hogerranjdar@yahoo.com
hogerswara@hotmail.com



## پێشەکی

خۆشەویستان وخوێنەرانی شیعری کوردی،خۆم بەبەختەوەردەزانم لەرێی بڵاوبونەوەی ئەم پەرتوکەشیعریەم، بتوانم خزمەتێک بەئەدەب ورەوتی شیعری کوردی بکەم و کەلێنێک پربکەمەوە لەئەدەبی کوردی دا..... خوێنەرانی بەرێز بەپێویستم زانی کەپێشەکییەک بۆئەم پەرتوکەم بنوسم، کەبڵاو بونەوەی هیواو خەون وئاواتم بوو،کەماوەیەکی زۆریشەخەریکی نوسینی ئەم شیعرانەم و بەڵام تائێستا پەچاپم نەگەیاندبون...... دەمەوێ لێرەدا ئەوەی مەبەستەبیڵێم ئەوشیعرانەی کەنوسیومە، هەموی لەهەست وگیان وویژدانمەوەسەرچاوەیان گرتووەو لەدایک بون . زۆرجاری واهەبوەلەنوسینیان فرمێسکیان پێ باراندووم ........ ئەوئەشقەی کەپێ نوسی لەدەست نام و،ووشەی خۆشەویستی پێ نوسیم هەرئەوئەشقەش بوو، خولیای شیعری کردم ، وای لێ کردم وەک هەناسەنەتوانم بەبێی بژیم و، هەمیشەبەرێزەوەش سەیری خۆشەویستی بکەم و تا سەرئێسقان باوەرم بەخۆشەویستی راستەقینەهەبێت و زۆربەپاکی مامەڵەلەگەڵ خۆشەویستی دا بکەم . باوەریشم وابووەئەگەرخۆشەویستی نەبوایەئەوا ژیانیش هەرگیز نەدەبو بۆیەبەرێزەوەسەیرم کردووەو،تائێستاشی لەگەڵ دابێ یادەوەریەکانی خۆشەویستی هەگبەی پر ووشەی شیعرەکانمن وەپاڵ پشتێکی بەهێزیشن

بۆ شیعرەکانم....... هەرئەو ئەشقەش وای کردهەموشتێکیشم بەپاکی خۆش بووێ و،ئەشقی خاک وسروشت وجوانی بم. هەرئەوخۆشەویستییەش بوو فێری کردم کەڕێز بۆ هەمو کەسێک دابنێم تەنها ئەوانەنەبن کەدژی گەل و خاکەکەمن، بۆیە ڕێزو خۆشەویستیم هەردەم بۆ ڕەگەزی بەرامبەرم هەبووەوهەمیشەبەچاوی ڕێزەوەلێیان دەڕوانم و پشتگیریش لەمافەڕەواکانیان دەکەم و هەرئەوانیشن بو نەتەئیلهامی شیعرەکانم .......

بەڕێزان ئەوشیعرانەی دەی خوێنەوەزۆربەیان ڕەنگ دانەوەی ڕاستین وجا چ لەژیان و خۆشەویستی خۆم ڕوی دابێ یان لەناوکۆمەڵ گاو دەورو بەرم ڕویان دابێ . باوەڕیشم بەوەهەیەکەهەست وخەیاڵ و زمان ڕوحووجەستەی شعر پێک دەهێنن.... بەڕێزان من لەنوسینی شیعرەکانم هەولم داوەزمانێکی سادەبەکاربێنم بۆئەوەی بەئاسانی خوێنەر بتوانێ تێی بگات و توشی گێژاو و دامان نەبێت و لەوباوەڕەش دام شیعربەزمانێکی سادەبنوسرێ بۆئەوەی کەسی خوێنەرلەخوێندنەوەی بێزار نەبێ.... ئەوەی ماوەبیلێم سوپاسی ئەوکەسانەدەکەم کەلەگەلم ماندوبون وئەرکیان کێشا بۆ بەچاپ گەیاندنی ئەم پەرتوکەم هیوادارم جێگای سودو ڕەزامەنیتان بێ.... لەگەڵ ڕێزم

**هۆگر ڕەنجدەر**
8002-4-42



**منالآنی وولآتەکەم**

منالآنی هەمودونیا،
بەمۆسیقا سەمادەکەن
منالآنی وولآتەکەم،
بۆلەتێ نان...
کێڵگەی ووشکی شەقامەکان
بێ زار دەکەن.
لەنەبونی و، ڕوتو قوتی،
بۆسکی برسی،
لەسواڵ کەرێکی،هەژارو
بێ لانەدا...
سواڵ دەکەن...

1992-2-1 هەولێر

## ئێوارەبەفرێک

ئێوارەهات،دونیا کپ بوو،
بەفریش ورد ورد، دەهاتەخوار...
شارەکەی من ،سپی پۆشی
هەروەک بوکی باڵا چنار.
شەقامەکان ..
بەبێ دەنگی،
چاویان نایەخەوونوستن
گلۆپەکانی سەرشەقام،
تادرەنگی شەو،
لەگەڵ بەفردا دانیشتن
لەدوایدا سەریان داگرت،
بەسەرشەقام
ڕوناکیان هیچ لێ نەماو،
بەتەنیامام
گفتوگۆم کرد هەرلەم شەوە
لەگەڵ بەفری هەناسەسارد
کەمن وتم بەفری سپی....
قسەی بڕیم،داخی بۆم نارد
سەرم بڵند کرد ،
ئاسمانی جوان،



بەفری لەباوەش گرتووە
ئەستێرەکان، یەکیان دیار نین
مانگیش وەکو، وان نوستووە...
منیش ناچارلەگەڵ خۆم دا
لەگەڵ لالەی پێشم بدوێم
بەڵام ئەویش،وردەوردە
بێ خوڵق بوو،
تاریک بوو جێم
منیش ناچار
سەرم داگرت،بەسەر سەرین،
چاوم لێک نا
تا کازێوەبەفر نەنوست
منی لەگەڵ ، خۆی ڕاهێنا

هەولێر 1992-12-27

## ئەمڕۆکەیار

ئەمڕۆکەیار،
وەکو،
بوکی باوک مردوو،
جلی ڕەشی وا پۆشیوە.!!
لەسەرتاسەرلەڕەش پۆشی
گوڵی لەیاخەی چنیوە...
دەمێک قاقالەسەرلێوی،
وەک پەڕەی گوڵ،
لەبا غی ژینم وەریوە...
دەمێک گریان لەچاوانی،
بەبێ دەنگی...
بەس من
فرمێسکم، نەد یوە...

هەولێر 1992 12--30



## بەیانی بوو

بەیانی بوو...
هەڵ سام لەخەو،
کەسەیرم کرد،
واتیشکی خۆر،
لێوەکانی زەمین دەمژی،
هەرلەوشوێنەش،
بولبول دەگری
پرسیم لەگوڵ،
بۆچی دەگری ...
ئادوێنێکەهەرلەوکاتە
کەبولبول هات
خۆرحێی هێشتین،
ڕۆی وهەڵات
بو بەباران...
جالەداخان
ئیمڕۆ دەگری...

هەولێر 1993-3-7

## لەکڕنۆشدا...

کەلەنوێژدا
ڕووەوکەعبە،ڕاوەستابووم،
نوێژم دەکرد.
لەکاتێکدا،کڕنۆشم برد،
تۆم هاتەیاد بیری تۆم کرد.
بەڵام ترسام لەونوێژەدا
ووتم نەوەک خوای بەخشندە
بەنوێژێکی پاک ودروست
لێم وەرنەگرێ
چونکەئازیز،
لەکاتی نوێژ،بیری تۆم کرد...

1993-4-7 هەولێر



## من بەربەست نەبوم

گەواهینە شیعرەکانم ،بۆئەم حەقە
کەبەربەست نەبووم _
لەکرد نەپەنجەت ئەڵقە.
خۆت بەربەست بوی،
تۆخۆت نەت ویست،
ببمە زاوای،
ژووری پەردە
تۆخۆت نەت ویست،
شەوانەهای تەمەنی ژین
تەزوی شیرین
پێک ببەخشین...
تۆخۆت نەت ویست،
ببم بەمەم، ببی بەزین
تۆکەنەت ویست،
پێ کەوەبین...
لەباغێکدا پێکرا بژین
ئێستا خامە،
لەجیاتی تۆبۆتەهاوسەر
شەوبێ دارەلەگەڵ ڕەنجەدەر
بێ باکم لێت ،
لەباوەشی هەرلاوێکا،
گەر بخەوی و،بی سوتێنی

جارێکی تردڵی ڕەنجد ەر،
بەجوانیەکەت ڕاناچڵەکیَ،
بەدرۆکانت خورپەناکات
نابێتن بەکۆتری سپی،
بەرەوکێڵگەی برسی سینەت
شەقەی باڵی موژد ەنادات....
ئەوپەیکەرەی
شیعرم دای ڕشت
لێت نابورێت،
تەفرەت دەدات...

1993-3-12 هەولێر



## کەلێک ترازاین ...

کەلێک ترازاین،
من وام زانی
چیتر لێوم
بەلێوی تۆ،ناگاتەوە.
پەنجەکانم چیتر ئازیز،
دوگمەی سینەت،
ناکاتەوە...
بەڵام ئۆخەی لەوژوانەدا،
وەک ئەوبارانەی دەباری،
ڕژامەسەر...
کێڵگەی ووشکی سینەی تینووت .
لێوەکانیان لیَ سورکردم،
ماچی سینەت ...
وەک ڕەنگی ڕوت ...

1996-12-9 هەولێر

## لەوكاتانەی ...

لەوكاتانەی ،
شنەی شەماڵ،
بەسەرڕوتا ، تێ ئەپەڕێ و،
دڵ گیر ئەبێ...
گێژوان ئەگرێ،
بۆ خەندەیەک
لەلێوانتا بترازێت و،
ئۆقرەبگرێ...
هەمان خەندە،
ئەبتەئیلهامێکی شیعر
کرنۆش ئەباتن بۆخودا
گەرلەوكفرەی ،
کردویەتی...
لێی ببورێ.

هەولێر 1993-12-10



## مەرگی ڕێی ژوان

هاتەڕێی دڵ
مەرگ بێتو،
یاخەم بگرێ و
بۆجێ ژوانی...
چاوەڕوانی
ئەودیوی ڕوی،
ژینم بەرێ...
بەڵام ئۆخەی،
لەودەمەدا...
((عزرائیل)) لەسەرسەفەربوو
هاتو بەلام دا تێ پەڕی...
خەندەیەکی،
بێ چاوەڕێی هاتەبەرێ...

هەولێر 1993-12-13

## لەپەیما نم پەشیمان نیم

لەپەیمانم پەشیمان نیم،
بۆ جێ ژوان وبەهاری دڵ...
بۆخەندەیەک،
کەبترازێت ،لەلێوی گوڵ.
بەڵام ئازیز،
ئەزانی بۆچی دڵ تەنگم ؟!
لەورۆژەوەی ،
کەهاتیت و،
بەلای باغی دڵم ڕات بورد.
گوڵانی باغ،
یەک یەکیان،
هەڵسانە سەرپێ و،
لەپێش وازیت.
کڕنۆشیان برد.

بەڵام ئەتۆش بەلالوتی
بەلایانەوەتێ پەڕی
الههەشمەتان
خۆیان تەکاندو،هەڵ وەرین....

7-3-1994 هەولێر



## خۆشەویستم

تۆپێم دەڵێی تاکو ئێستا
خەندەم لەلێوت نەدیوە،
بۆجێژوانێ پەیمان بدەی.!!!
باپێت بڵێم،
ئازیزەکەم
خەندەبۆکەسێکەخەمی ،نەبێ...
خەندەبۆکەسێکە
ژانی نەبێ...
خەندەبۆکەسێکە، برینی نەبێ...
بڕوابکە
من،سەرتاپای
ژینم،خەمەو،
سینەشم کێڵگەی برینە
دڵ خەڵوزی ئاگردانی هەژارانە.
دەپێم بڵێ،
مانای خەندە لەم ژیانە؟
بڕوابکە،!
تۆ،کەی هەژارێکت بینی ،
لەسێ بەری مزگەوتێکا،
بەتێری خەوتووەگیانە.
میحرابی ئەوشوێنە... بۆمن...
هەمورۆژخەندەوجێی ژوانە....

1994-1-13 هەولێر

# ئاوێنەی ژین

ما وەیەکەهەرلاپەڕێک،
لەشیعرێکم،هەڵ دەمەوە
وێنەی تۆی لێ بەدی دەکەم.
ماوەیەکەهەرباخچەیەک،
لەم ژیانەشی کەمەوە
تۆی تاقەگوڵ یاد ت بکەم.
بەس نازانم بۆبێ دەنگی؟
تۆ بەهاری وپڕلەڕەنگی...
دولبەرەکەم،
تۆ ئاوێنەی بەرهەتاوی
سەیری،
تیشکی دوورت دەکەم
زۆرحەزدەکەم،
ژیانی خۆمی پێ ڕوناک کەم
دەریا ماسی ،
لەهەناوی، خۆی دەژێنێ
منیش لەگەڵ ژیانی خۆم،
تێ کەڵت کەم...

19—3—1996 هەولێر



# توڕەبە

دەتوڕەبە،
ئاوێنەی ژیان بشکێنە
تریفەی مانگ ،
لەشەوێکی زیویدا بتۆرێنە
بسیڕێنە!
شەپۆلی ئا و،
لەدەریادا بوەستێنە
بم گرێنە،بم سوتێنە
بۆ جارێکیش... بێ،
تەواو تەواو،توڕەبە
ئەوسا تۆم زیاترخۆش دەوێ
چونکەتۆ،
بەتوڕەیەوە،
گەلێ جوانی ...

1996-4-18 هەولێر

## با وانەکەم

باوانەکەم،
کەشەودادێ و،
ژان دەم گرێ.
وەکوسروشت،
لێم ئەبێتەوەرزی پایز.
هەرچی
گەڵای بیرم هەیە،
هەڵ دەوەرێ.
ناگەن بەقەد،
باڵای ئازیز.
باوانەکەم،
هەرئەودەمە،
زۆرحەزدەکەم
لەنێوزوڵفت،خۆم حەشاردەم.
دەست لەملت کەم
یەک یەک داوەتاڵەکانی،
زوڵفت ماچ کەم
لەتەک گەردەنی شوشەیت
بەخوێنی دڵ،
وێنەی خۆرێکی هەڵاتوی ،
لێ نەخش کەم.
باوانەکەم ...

1996-11-21 هەولێر



## ئەم نیوەڕۆیە

نیوەڕۆیەو،
تۆش سێرەت گرت
لەدڵەی پڕغەم ،
تیرت پێکا
مەبەستەکەی بۆ هاتەدی
بیرهێنانەوەی،
ڕۆژانی ڕابردووبوو!
بەڵام ئازیز
دەزانی دڵ بڕیاری دا
تەنیا بژی.
تەنیا کێوی ژیان ببڕی

1997-4-4 هەولێر

## یادگاریەکان...

قەت ناتوانم یادگاریەکان
لەگەڵ تۆدا لەبیر بکەم.
ئەوژوانەی لێی پێ گەیی،
بەم شێوەیەواچۆڵی کەم.
بڕوا بکە، کەشەودادێ
شەوەکانی ئەم زستانە.
بەتەواوی بیرت دەکەم
بیری سینەو،
ماچی تەڕی لێوت دەکەم.
کەشەودادێ...
پانۆڕامای یادگاریەکان
وەکوفیلم،
لەسەرپەردەی چاوەکانم،
سەرلەنوێ پەخش دەکرێ...
لەلایەک لێو، لێوت دەمژێ
پەنجەکانم مەمکت دەگرێ
تاکازێوەئابەم دەردە،
دڵ نەک جارێ،
سەد جار دەمرێ ...

1997-11-20 هەولێر



## لەوڕۆژەوەی لەدایک بوم

لەوڕۆژەوەی لەدایک بووم
چاوم بەسروشت هەڵێنا
ئەشقی خاک بووم
ئەشقی تا ڤگەو،
دۆڵ وچیاو،
تارای سپی سەری شاخ بووم
وەکو بەفری، چیاکانم
وادڵ پاک بووم
فێر بووم ،لێیان
بەسەربەستی بیرکەمەوە
پەیمان بدەم،بەستەڵەکی،
ڕێگاکانم بکەمەوە
هەرچی قینە،لەم ژیانە
بی سڕمەوە

1997-12-1 هەولێر

# ئەم ئێوارە....

ئەم ئێوارەکەتەنیا بووم،
زۆر دڵ تەنگو بێ هیوابووم...
تەنیا ڕێگام گرتبووەبەر،
تەواو بێ زار،لەخۆم بەدەر.
وەک فریشتە،
ئەتۆ هاتیو، بۆم دەرکەوتی.
بوی بەتیرێ،
بەناوەندی دڵم کەوتی.
گەردەت زانی،
چەند تامەزرۆی دیدارت بووم،!!
لەڕۆژێکی وەکو ئەم ڕۆ کەیارت بووم...
لەیەک سات،لەنێو  ئەم شارە،
لەنێو ئەوگوڵانەی ،دیارە...
دەساڵی ڕابردوی تەمەن،
هاتەوەبیرم دوبارە.!!!
ژان دای گرتم وەکو جاران،
جارێک وادەت دابوو،بۆژوان...
گوڵم دیارەبەم ئێوارە
ساردەهاتی،
هەر  لەسەروادەو... وەفاتی

1997-12-29 هەولێر



# برای شیرینم

کەڕۆیشتی بەبێ پرس
بەجێت هێشتم
تامی تاڵی ئەوکۆچەی تۆ،
ژەهری ماربوو
بەناسۆرەوە، پێت چێشتم.
شەوتابەیان،چاو بەگریان
فرمێسکی،خوێنت،
پێ ڕێشتم.
بۆ هەواڵی زە نگێکی تۆ،
بۆئاسمانیش ، دەڕۆیشتم
دەمێک لورەی گورگ و،
دەمێک ،حەپەی سەگ بو،
هیواو ئاواتی دەکوشتم
دەمێک دەنگی ،
مرۆڤ فرۆش بو،
بەقاقاوە،
بەئاسانی لێ ی دەفرۆشتم
چ ، ڕۆژگارێکی ناخۆش بوون،
ئەو ڕۆژانەم نێنەوەیاد ،
لەمن بۆتە
شێرپەنجەی  نێو،
خوێن وگۆشتم ...

هەولێر    2002-4-24

# چ سڕێکه...

چ سرێکەلەچاوانتا،
واچۆک بەچیپادا ئەدا
چ سڕێکەلەلێوانتا،
ئاگرلەهەناو،
بەر دەدا...
دەسا ڕوحمێ،
ئارام گەکەی، دڵی بێدار
زۆرت سوتاند،
ئاشقانی ئەم سەردەمە،
نەوەک هەرمن...
سەدان هەزار

2002-7-9 هەولێر

# دڵەی پڕخەم

مەکەمەنعی دڵەی پڕخەم
بۆماچێکی لێوی ناسک
شەی دای زوڵف وباڵای ڕێکتم
لارو لەنجەت شێوەی ئاسک
چۆک دائەدەم بۆسەرکردن
بەسینەی تەختی سەدەفی
گەر ڕازی بی لەنێو دڵدا
لەم بەهەشتەبیمەنەفی

2002-8-2 هەولێر



# خیانەت

ووتم لەخیانەت دەترسم
ووتــت بەڵــێنم بەتۆدا
ووتم لەگـفتت دەترسم
ووتت سوێندی من بەخودا
خۆدەمزانی ڕۆژێ دادێ
گفتەکانت هەرەس دێنێ
هیواوحەزوئارەزوی من
لەڕەگەوەدەردەهێنێ
بەڵام بڕۆ لەمن دووربە
گوڵی بێ بۆنی خۆش گفتار
ڕۆژێ دادێ دەت بینمەوە
لەڕ واڵەتیش هەر شەرمەزار
ئـەمـەکـاروانـی ژیانـەو
مرۆڤ دەوران زۆردەبینێ
هەموشـتـێک دێت ودەڕوا
تەنها ڕاستی خۆی ئەمێنێ

7---2006-23 هەولێر

## وەکوبوڕکان ...

هەموشەوێ، لەناخەوە
وەکوبوڕکان،
بۆ باوەشی ئاسمان دەچم
ئاسمان بەرگەی،
گڕم ناگرێ...
دێمەوەخوار
بۆ باوەشی دەریا دەچم،
جانازانم...
لەقوڵایی،
لەکەناری یاخود
دەمرم ...

2006-7-28 هەولێر



## ژینم بێتۆ

تازەچۆن ئیتربژیم بەبێ تۆ
ڕێگای ژین بگرم بێ هەناسەی تۆ

تۆوا دەزانی ئەوها ئا سانە
ژان وبرینەدا بڕانی تۆ

ئەی خودا چارەبۆ ئەم برینە
دەرمانی دەردم کەوتەدەستی تۆ

زۆربەبێ باکی بێ هەواڵ پرسین
ڕۆی وجێی هێشتم پێی کرد م ڕۆڕۆ

توخدا کەی وایەڕێسای دڵداری
من لەخەم بمرم شادیش بەس بۆتۆ

2006-8-6 هەولێر

# بۆچی هاتی

بۆ چی هاتی،من لەمێژبوو
دەرگای د ڵم د اخســتبـوو
هەرچی پەیمان ووەفایە
لەگەڵ کەسدا نەم بەستبوو
چاک دەمزانی ئەود ڵەی من
بەرگەی ئەم ژانەناگرێ
کەگڕی گرت وەکو بوڕکان
دەریا نێـتن دانامــرێ

هەولێر 2006-8-12

# ئەشقت چییە

من نازانم ئەشقت چییە
وا ژیـانـی داگیر کردوم
ئەژنۆم شلەڕێ داناگرم
لەتـاود لێ ئاگر گرتـوم
دەساڕوحمێ خودای بێ دار
تۆهیوامی بۆئەم دە رد ە
کەناتوانم هەنگاو بنێــم
تابزانم هێــزم چــە ندە
زۆرتـامـەزرۆی دیـداریـمـە
بەتەواوی بیـــری دەکەم
زۆرزەحمەتە حاڵ وابـڕوا
ئا واژیان بــەســەرببەم

هەولێر 2006-8-22



# ئەستێرەکان

ئەستێرەکان
هەمو وەرن،
ئەم شەوئێشکم لەگەڵ بگرن.
من ناخەوم،
لەگەڵ ئێوە،
گوێ لەزامی دڵم بگــرن.
لێی بپرسن لێی تێ بگـەن،
کەمێک،
خـەمی لەگەڵ هەڵ گرن.
لەتاوقوڵی زامەکانم،
دڵ ودەرون هەموی ســـــڕن.
بیر بڕناکا...
بەهیچ شـتێک ...
لەم زەمانە
حاڵ وابڕوا،
ئەبێ بێنو پرسەبگرن...

هەولێر 2006-8-31

## خۆزگەگوڵم

خۆزگەگوڵم،
وەک ئەستێرەهەموشەوێ ،
لەئاسمانی بێ نازی من،
دەرکەوتبـا یە...
تەمو مژی،
شەوی درێژی بێ کۆتای من
بەیەک (بەڵێ)ی،
وەک وجاران بماڵیـایە...

* * *

ئەوساد ڵم، خامۆش دەبو،
چاوی ئەنابۆبەیانی،
موژدەی ئەدابەسپێدە،
کەنێوناخی پڕهیوایە...
دەساڕوحمێ ژوانێ دانێ،
تائارام بم بەبینینت .
بۆ نازانی ماسی ڕوحم،
هێندەئاشقی دەریایە...

2006-8-31 هەولێر



## دڵم پڕە

د ڵم پڕە،
د ایم حەزم لەگریانە
هەموشەوێ،دڵم،لەلای
کۆنەژوانە.
د ێتەوەیاد،
ئەوگفتانەی هەمورِۆژێ
ئەت گوت گیانە
جوتێ سێو وماچی لێوم،
یەکەم د یاری دیدارمانە.
ئەی بۆکوێ چون،
بەڵێنەکانی ،ڕۆژی ڕون
نەگەینەسەردەڵێی گیانە
لەم زەمانە،
گشت ئاشقێ،
سوتوی،
شکانی پەیمانە
بۆیە،زامی،جەرگی منیش،
بێ چارەیەو،بێ دەرمانە،
پڕلەژانە....

2006-9-1 هەولێر

## ئەودڵەی من!

من نازانم ئەودڵەی من
بۆشێتانەخۆشی ویستی
تاگەیشتەئەوڕادەیەی
وەکوبتێ بت پەرستی
لەوەتەی هەم لەژیانم
سوجدەم نەبردبۆهیچ بتێ
دڵی تۆبوبێ ڕەحمانە
وەکوبتێک لەمن ویستی

2006-9-20 هەولێر



## بەڵێن بێ پێت

بەڵێن بێ پێت،
لەپاش مەرگت ،
خەندەنێتەلێوانی من.
گوڵ بۆن نەکەم،
بەهاریش بێ ،
با کەس نێتەژوانی من.
پێویستم بوی وەک وهەتاو
ڕێگای تاریکم ڕووناک کەی
پێویستم بوی هەروەک وئاو
کێڵگەی ووشکم بۆپاراو کەی
بڕوابکە،
خۆشم دەوێی زیاترلەخۆم .!
نەڕۆژم ڕۆژ،
نەشەوم شەو ،
لەبیری تۆم
بەڵام نەم زانی وا دەڕۆی
برینێکی ئاوا بەسۆی
لەم ژینەتاڵەجێم دێڵی
بەس یادگاری بەجێ دێڵی
هەناوم چەشنی تەندورە
لەوساتەوەی تۆم لێ دورە
خۆزگەمەرگ نەهاتبایە
تۆی لەمن ، دانەبڕی بایە

2006-11-19 هەولێر

## تیری چاوت

تیری چاوت وەکوبڕنەو
پێکانیشانەی مەبەستی
کاری گەربوئەوتیرەی تۆ
خوێن لەجەرگم  ڕاناوەستی
دەساڕوحمێ ئارام گەی دڵ
شادی بێنەبەسەپەستی
خۆمن دیل نیم لەبەند دابم
بەبێ شەراب بەسە مەستی
سەرم گێژەدولبەرەکەم
وەک پەروانەڕانا وەستی
بەدەوری خۆی واخول ئەدا
زۆردەترسێ لەژیانی
ئەوەی یەک جارکەمار گەستی

2006-12-10 هەولێر



## هەموشەوێ

هەموشەوێ،
تابەیانی ،
بەپەنجەی دەست کات دەژمێرم
تاگزنگی هەتاو هەڵ دێ،
شیعرێکی جوان،دەنوسم  و،
بۆت دەنێرم.
ووشەکانی
وەک، چاوت جوان.
وەک،کوڵمەت ئاڵ.
وەک،ناوت قوڵ.
ووشەکانی
پڕ،لەخۆشی،دوربێ لەژان.
بۆت دەنێرم،
لەیەک چرکە،بگا بەتۆ
چ جوان هەیەلەدونیادا،
ناگا بەجوانی ،جوانی تۆ.

2006-12-13 هەولێر

## سەرخۆش نابم

مەستی کردم قسەکانی ئەونیوەڕۆ
کەپێت گوتم بۆ ئەوژووانەشەڕاب بخۆ
باپێت بڵێم من بەشەڕاب سەرخۆش نابم
لەهەرکۆڕێک لەهەرشوێنێکی دونیابم
چا وانی تۆ مەستم دەکەن بەبێ شەڕاب
ماچی سینەولێوی ئا ڵت بەبێ حسا ب
دەم بەنەنێودونیای خەون دونیای خەیاڵ
سەرخۆش نابم هەزار شوشەش بکەم بەتاڵ
گەردەتەوێ بەسەرخۆشی من ببینی
بەکەیفی خۆت وێنەی مەشکەبم هەژێنی
ئەبێت بۆمن هێواش هێواش دەمت بێنی
بۆ ئارەزوم دوگمەی سینەت بترازێنی
ئەوجامن بۆت ئاشقێکی سەرخۆش دەبم
لەسەر سینەولەسەرڕانت بێ هۆش دەبم

هەولێر 2006-12-15



## پەشیمان نیم

پەشیمان نیم سۆزم پێدای،
وەکو چاوم خۆشم ویستی.
هەرچی جوان بو،
لەدنیادا،
وەک ڕەنگەکان،
بۆ پەرچەمت،دڵم ویستی.
بەڵام چی بکەم!!
شەپۆلەشێتەکانی تۆ...
ڕاناوەستی
بۆ کێ دەچم ،
ڕێگا کانم لێ دەبەستی.

هەولێر 2006-12-26

# ئەشقی منت نەناسیوە

ئەشقی منت نەناسیوە
چەند دڵ سۆزەبۆئەشقی تۆ.
هێشتا نەت دیوەسۆزی من
کەکەس نیەلەبیری من،
جگەلەتۆ.
بەس تێناگەم.!
تۆ بۆچی هێندەلاساری.؟
هەڵ دەکەی...
شنەی،شەماڵی
کەدەگەی،تۆزوغوباری
باش بزانە،
ئەشقت لەدڵم ،قەت پیرنابێ
لێش نەگەڕێی،کەشتی دڵم،
لەکەناری دەریادابێ
دەلێ گەڕێ، بەئارامی ،
لەنگەر بگرێ
بۆ هەموکات ترسی دڵم
لەهاتنی ڕەشەبا بێ

2007-1-2 هەولێر



# کەتۆم خۆش ویست

کەتۆم خۆش ویست ،
من وام زانی،
دەریایەکی زۆر ئارامی .
کەشتی دڵم
لەکەنارت، لەنگەر دەگرێ،
تا دەگاتن بەئاکامی.
بەس نەمزانی!
شەپۆلی تۆ،زۆرتیژڕۆیە
تریفەی مانگەشەو،
لەباوەش ناگرێ...
ڕقی لەهەموشتێکە،
وەفاو پەیمان لەخۆناگرێ.
ئاخ....
چەند ڕقم لەدرۆیە
بەڕۆژی ڕون کەبۆم بکرێ.
بۆیەمن،پێت باوەڕناکەم،
شیرت هەوریش ،دابهێنێ و
چیاش ببڕێ..

2007-1-7 هەولێر

## قەدەروابو

قەدەروابو تۆ بناسم
تالێرانەش یادت بکەم
بڕوابکەهەرچەنددووری
وەکوجاران بۆنت دەکەم
وەکو جاران خۆشم دەوێی
هەربەیادت زکردەکەم
هەرتەکییەی تۆشک دەبینم
کەشەونخونی لێ بکەم
حەڵقەی زکری لێ دابەستم
حای وحوی ئەشقی لێ بکەم

2007-1-16 سوریا



## بۆهەولێر

شارەکەم شاری شیرین
بوکی بێ نازی ڕووی زەمین
لەهەرکوێبم یادت دەکەم
بەدڵ خۆ م قوربانت دەکەم
بۆ کێ دەچم وەک زیندانە
دووریت بۆ من مایەی ژانە
بـەنـیـازم وا دێـمـــەوە
لەبا وەشت دەژێـمـــەوە
ژیان دووریت لا م بێ ڕەنگە
لەلا ی تۆژینم پڕ سەنگە
دێمەوەبا وەشی گەرمت
لا ی کچانی پڕلەشەرمت
یەک یەک سڵاولەداروبەرد
لەمنارەوقەڵای نەبەرد
ســڵاو کـوڕوکچـانی شار
ئـاشـقانــی دڵ بـریندار

2007 1--17 سوریا

## بەجێم مێڵە....

بەجێم مێڵە،
لەکەناری دەریای خەم دا!
دەستم بگرە،
تانەکەومەتەمی شەودا.
لەوەتەی هەم،
سینەم پڕزام و برینە
بێ تیمارە،
حەودالی ووشەی شیرینە
دەستم بگرەو،بەجێم مێڵە
لەدەریادا
دەزانم ،ئێستا زریانە
لەکەناری،
شڵپ وهۆڕی
شەپۆڵەکانی جارانە
بەجێم مێڵە،
توخوا گیانە
کوانێ کاتی دابڕانە

2007-2-20 هەولێر



## نەورۆزدەکەم

واها تەوەجەژنی نەورۆز
جەژنی کوردی پڕبرینم
بەئالاوەنەورۆز د ەکە م
مەرگی دا گیر کەر دەبینم

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

نەورۆز دەکەم لەهەرچوار لا
تا بلێسەی ئا گری ســــوور
مو ژدە بدا بەتـاریکی
بۆ هەموکورد نزیک ودوور

❊ ❊ ❊ ❊

دەست لەناو دەست ئەی کوردینە
کوتکی کا و ەبا هەڵ گریــن
بۆ نەورۆزی ئەم بەها رە
بەرەو تە ختی زوحا ک بچین

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

بەدەم سرودی ئەی ڕەقیب
ئالا ی شکۆ دارمان هەڵ کەین
دەست لەناو دەست بۆپێشەوە
جەرگی دوژ منانمان دا غ کەین

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

2007-3-15 هەولێر

## بۆچی هاتووم؟

لێم مەپرسە،
بۆچی، هاتووم،!!
ڕێگای دوورم زۆربڕیوەو،
شەکەت ماندووم...
ئەم جارەیان هاتنی من،
وەک هاتنی جاران نیە.!
بۆماچی لێو،
بۆبینینی،چاوەکانت و،
بۆژوان نیە.!
من،نەهاتوم ئەم جارەیان
کەپێت بڵێم،
خۆشم دەوێ ی...
ئارام ناگرم لەدوریت و،
دڵ دەیەوێ ی...
من ،کەهاتوومــ
جیا لەهەموجارانی تر
تانەکەومەدڵەڕاوکێ،
لەهیچ ژوانێ...جارێکی تر
من واهاتوومــ
پڕبەدڵم ریسوات بکەم
لەهۆنراوەوشیعرەکانم،
وەکوبتی نەفرەت لێکراو
بتشکێنم،!
دەرت بکەم ...
چیترمن نەبینم چاوت.



تابمێنم نێ نم ناوت.
هاتووم،
ئەمەت، بیرخەمەوە
لەشەقامی یادگاریەکان،
نامەکانت بکەمەوە
ئەوشیعرانەی کەناردبووت
بی سرمەوە
کەنوسی بووت....
((د ڵت د ڵمە،دڵم د ڵتە
بەد ڵ د ڵم، د ڵ تی دەوێ
د ڵت نەبێ د ڵم –
لەلێ دان دەکەوێ))#
بەڵێ هاتووم،
چیتر ڕازم نادرکێنم
بەدرۆکانت فریووناخۆم،
تابمێنمـــــ
دواین جارە،واهاتوومو،
کەپێت بڵێم.
برۆبرۆ...
یاخەم بەردەو،
چیترد ڵم ، د ڵتی ناوێ.
هەموڕۆژێ،
لەگەڵ گەردی بەیانی دا
دەچی تەباوەشی لاوێ....

2007-3-29 هەولێر

* ئەم دێرەشیعرەهی خۆم نیە نازانم هی کێ یە

## بۆعبداللە پەشێو

هەموڕۆژێ،
شیعرەکانت دەخوێنمەوە.
لەدەرگایان،هەڵ دەکورمێم،
چاوی یەک یەکیان ماچ دەکەم
کەدەرگایان لێ کرد مەوە....

چەند شیرینن ووشەکانت،
کێدەڵێ((ئاسمان گەڕنین))
من دەگەڕێم،لەئاسمانیش
ووشەی وەک تۆنادۆزمەوە....
پەشێوشاگوڵی گوڵزاری،
ووڵاتی من .
ئاوی کانی،دوندی چیا،
بەفری سپی ووڵاتی من .

گەر،بەبەرزیت دا هەڵ گەڕێم،
ناگەمەدوند...
هێند ەبەرزی وەک وئاسمان
بەگەرووت دا بچمەخوارێ،
ناگەمەبن
هێند ەقوڵی،
وەکوقوڵی گشت زەریاکان.



پەشێو هەڵۆی بەرزەفڕی شاخ ودەشتم
ئاوی کانی،د وند ی چیاو، شیعروهەستم
دڵنیابەوانەکانت(نەخشەی ڕێگان)
وەکوجوتێ ، گوارەی ئەڵما س
لەگوێچکەدان
دڵم ڕوونەبۆبەرزایی سەردەکەوین
بەلای لایەی شیعرەکانت تێر دەخەوین...
پەشێوشاگوڵی گوڵزاری،
ووڵاتی من .
ئاوی کانی،
دوند ی چیاو،بەفری سپی ووڵاتی من ...
بەفری سپی ووڵاتی من .
2007-4-1 هەولێر

## ما چی ئەم ژوانە

بۆچی جێم دێڵی لەوشەوەتارە
دونیا ئارامەونەکەسیش دیارە
ئەی بەڵێن نەبوولێوانت بمژم
تۆبەخۆت وتت ژوانی ئەم جارە

** ** ** ** **

لەسەربەڵێنت واهاتومەژوان
تەنها مانگ دیارەوالەسەرسەرمان
دەلێوت شلکەو بەناز بۆم بێنە
تامانگی سەرمان بۆمان بێتەدوان

** ** ** ** **

دەدەمت بێنەوشەرتت ببەسەر
باماچی لێوت لام نەبتەکەسەر
ڕۆژێ دادێ تن دونیا جێ دێڵین
داد نادا دوای شیوەن بۆڕەنجدەر

2007-4-25 هەولێر



## گوڵی عومرم

کەسێ نییەلەم ژییانە
ژانی دڵم کەم کاتەوە
گوڵی عومرم نەژاکێنێ
باغی ووشکم ئاوداتەوە
من خۆم حەزم لەبەهارە
پایزم بیرنەخاتەوە
چونکەگەڵاڕێزان تاڵە
خەمم پەرەدەکاتەوە
سەرلەنوێ دەم گرێنێ
بۆیادی کۆن دەم باتەوە
بۆئەویادەی ڕۆژانی زوو
ئاگرلەدڵم ئەکاتەوە
بەڵام چیبکەم تازەڕۆیی
خۆربەزەوی ناگاتەوە
هەمودونیا چاک دەزانێ
شوشەبشکێ چاک نابتەوە
دڵی منیش وەکوشوشە
واشکاوەلەوساتەوە
عومریش وەکوباوادەڕوا
ئاوڕلەدواناداتەوە
کەسێ نییەخەم ڕەوێنم
مەگەرخودا بم باتەوە

2007-4-30 هەولێر

## شیوەنێک بۆنۆی ئایاری هەولێر

هەولێرەکەم،
چاک دەزانم،تۆپای تەختی و،
سەری بەرزت نەوی ناکەی...
وەک منارەسەربەرزەکەت،
ڕووەوئاسمان
هەڵ دەکشێیت و،چۆک دا نادەی...
هەولێرەکەم،
چاک دەزانم
تۆ... فرچکت بەقوربانی دان گرتو وە.
هیچ ساڵێکیش بێ قوربانی،
لەتەمەنت ڕەت نەبو وە.
هەولێرەکەم،
سەیری،لۆچەکانی نێوچەوانت دەکەم.
دەبێ هەر قوربانیت دابێ...؟
سەری چەندی،وەک هۆلاکۆت،
لەژێرچۆکت دادانابێ...؟
چاک دەزانم هەولێرەکەم
چاک دەزانم،
ڕەنگی پرچت...
خوێنەواسوری کردووە
زامی یەکی شوباتیشت،
هیشتاکە،ساڕێژ نەبووە...
چاک دەزانم هەولێرەکەم



چاک دەزانم،
برینی ئەم ڕۆ،
نێوچاوانی گرژکردوی
دەستەگوڵی،بەم بەیانییە،
لەباغ بردووی...
تەنها ئەتۆ،هەولێرەکەم
ـفرچکت بەقوربانی دان... وا گرتووە
لەوەتەی هەی ـ
هیچ ژوانێکت، بێ ژان نەبووە
ئای هەولێرەکەم
ئاخ هەولێرەکەم...
ئای بۆخەمی ئەم بەیانییەش
جەرگ برِو دڵ تەزێن بوو
دابارینی بارانێکی ،
پڕ لەخوێن بوو
هەولێرەکەم
من دڵ نیام،
چاوەکانیان بەڕوناکی تۆ هەڵ نایە
کەپای تەختی و،
تاجی شکۆت لەسەردایە
هەولێرەکەم،
من دەزانم
نەڕەشەباو،
نەباو بۆران نات هەژێنێ
سەیری ئاڵاکەت وادەکەم،
وەک منارەسەری بەرزەو،

شنەی شەماڵ دەی شەکێنێ
چۆک دانادا بۆ ڕەشەباو،
زراوی دوژمنان دەڕژێنێ...
بەڵێ هەولێر،
تۆ پای تەختی و،
فرچکت بەقوربانی دان وا  گرتووە
نەساڵێکت بێ قوربانی لێ ڕەت دەبێ و
نەساڵێکیش بێ قوربانی لێت ڕەت بووە...
بەڵێ هەولێر
تۆپای تەختی و،
فرچکت بەقوربانی دان وا گرتووە

2007-5-9 هەولێر



## وەرەباوەشم تێرخەوت کەم

داوادەکەی تێرخەوت کەم لەباوەشم
بە ئارەزوم  لە با وەشم تێربت کوشم
د ەبـفـەرمـەباوەشـی مـن ئـاوالآیە
بـاوەشـێکـی پڕلـەسۆزەودوای نـایـە
وەکوئاسمان دڵەی غەریب چاوەڕێتە
چاولەڕێیەوچاوە ڕوانی ترپەی پێتە
دەوەرەلام بەهێواشی سوک سوک وەرە
هەرکاتێک بێی ترپەی دڵم پڕخەبەرە
دودڵ  مە بەئارەزومەخەوی باوەش
تێرنیگاکەم مانگی ڕوت ودووچاوی گەش
زوڵفی خاوت لەسەرشانت پەرشوبلاو کەم
لەسەرسینگت پەنجەکانم فێری ڕاوکەم
دەبفەرمەباوەشی من قەت دای ناخەم
بێ ئارەزووت دەست بۆ بەری حەرام نابەم
ئاگادار بەئەگەر دێیتە ئا سما نی  من
نە تۆرێنی  ئە ستێرە کانی خەونی من

2007-5-29 هەولێر

## توجوانیتان من ببورن

من نازانم بۆچی هێندە،
لەڕاست ئافرەت،
چاوچنۆکم...
لەڕێگادا بیان بینم
کەجوان بن ،
دەشکێ چۆکم...
کەدەبینم لەنجەدەکەن،
شلکەی ڕان و،جوتێ هەنار
وەکوگورگی هارم لێ دێ ،!!
ئارەزوی تی، دڵی غەدار.
ئاخ کچانی نێوشارەکەم
باڵابەرزانی وەک چنار.
هیچ کامێکتان نارەنجێنم
هەمو وەکو، گوڵی بەهار...
من ، هەموتانم خۆش دەوێ
دڵی هەموتان ڕادەگرم.
زویرمەبن...لەڕێگادا،
کەچاولەچاوانتان دەبڕم.
دڵ نیابن، بەچاوی بەد،
سەیری هیچ کامێکتان ناکەم.
هەمولەچاوانم بەرزن،
بەزێڕی دونیاتان نادەم...



بەس چی بکەم دڵم وایە،
بەجوانیتان، دەتوێتەوە...
توجوانیتان،زویرمەبن،
جێ ی هەموتان،دەبێتەوە.
ناچمەبەهەشت...
ئەگەرئەمن،
یەکەم دەرگا ،
نەتان بینم.
ڕێگای دۆزەخ ،دەگرمەبەر،!
بەبێ ئێوە...چیەژینم.

2007-6-1 هەولێر

# مەرگی ژوانی سوور

دوربێ لەباڵات
مەرگی ژوانی سوور
بەبێ تۆناژیم
لەمن ببی دوور
ئەی خودا دەردی دوری گرانە
ژان وبـریـنـەئـەودابـڕانــە

چۆن بچمەژوانێک
تۆی لێ نەبینم
چۆن ئارام بگرم
چۆڵی ببینم
ئەی خودا دەردی دوری گرانە
ژان و بـریـنـە ئـەو د ابڕ انە

بەماچم لەژوان
من گەورەم کردی
دەک بەدکارچاوکوێر
کەلەمنی بردی
ئەی خودا دەردی دوری گرانە
ژان و بـریـنــەئـەو دابـڕانە

نەکەی دابیڕێی



ئاوێنەی ژینم
لەئاوێنەی ڕووت
ژیان دەبینم
ئەی خودادەردی دوری گرانە
ژان و بـریـنـەئـەودابـڕانـە

هەولێر 2007-6-16

## پەلەی چیمە

زۆردەترسم،!
تاتۆدەڵێی من ببینە،
دڵم دەرگای دڵێکی تر
بکاتەوە....
پەنجەکانم،ببنەشانەو،
لەسەرڕرۆیک قژێکی تر
هەڵ داتەوە.
بەمن دەڵێی،
پەلەی چیتە
هێشتازووە
بۆبینینی،ڕوخساری من.
بۆچی هێندە،تامەزرۆی تو
بۆئاشق بوی،بەنازناو و،
ئاکاری من.
من دەزانم،هێشتا گوڵم...
لەگوفتارو،
لەڕەفتارم، ئەتۆ ناگەی.
وەک باڵدارێکی بێ لانە
ئاسمانی دڵ دەگەڕێ ی تو
بڕیاری لانەی لێ نادەی.
باپێت بڵێم،
ئەمن بۆیەبینینی تۆم



وەک مەرەقێک،
لەناو چەقی دڵ چەقیوە
لەزۆرژوانان جوانم دیوە...
چەندیشیانم ڕاموسیوە
بەڵام هیچیان،
وەک وشەی تۆ
ناخی دڵمیان نەتەنیوە...

2007-6-28 هەولێر

## نهێنی شیعرەکانم

لەنهێنی، شیعرم ناگەم
هەندێ جاران،
بەمیوانیش بەلام نایە.

دەڵێی کچێکی شەرمنە
بەڵێن دەداو، دواى نایە

گەلێ جاران...
لەسەرسینەی، کچێکی شۆخ
خوانی ووشەی بۆڕادەخەم

گەلێ جاران...
پێش چونەژوان،
لەنیوەشەو
چرای ڕوحی بۆ هەڵ دەکەم

هەرئەودەمە...
ووشەکانم،
وەکو پۆلە،باڵدارێکی ،
ئاوەدانی و کانی نەدیو
لەدەست دەفرن ..



زۆردەترسم ڕۆژێ دابێ،!
ئەم ناسنەوە شیعرەکانم
پێش خۆم بمرن...

2007-6-29 هەولێر

## لەداستانی خۆشەویستیم تۆنەمرکەم

من دەمەوێ،!
وەک شیعرێکی،تەڕونەمر
لەداستانی خۆشەویستیم
تۆنەمرکەم...
چاوەکانت لەسێبەری
چنارێکی وەک خۆت چنار
ئارام بگرێ و،
چاوگەش ترکەم...
من دەمەوێ،!
ئەوسێبەرەدواین وێستگەی
ئارامیت بێ...
من دەمەوێ،!
ئەو وێستگەیەسەرچاوەی،
خۆشی وشادیت بێ...

* * * * * *

دوودڵ مەبە،
ئەی شۆڕەژن. منیش شانم
تامەزرۆیە...
سەرێک بێتو
بەئارەزوی سەری پێ کا
یاساو ڕێساکان بشکێنێ



تاشل دەبێ بادەتێ کا
بێ ترس بەدڵ کراوەم
دڵ نیابە...
دڵی شاعیر
خەتا ناکا.
شانم چاوەڕێی سەرتە
بەهێواشی سەری پێکە

هەولێر 29-6-2007

## سۆزی دەنگت

دەنگت شنەی بای نەسیمە
ئارام دەبم کەدێتەگوێم

بەیانیان گوێ هەڵ دەخەم
تادەنگت دێ هەرچاوەرێم

هەرچاوەڕێم بۆ ئاوازێ
لەلێوانی تۆ بترازێ

خەمی دونیام بۆ وەلانێ
بۆم باس بکا نازو ڕازێ

باسی جوانی وخۆشەویستیت
ئارام دەکا گیان وجەستەم

دڵ نیابەلەم دونیایە
هەر بۆتۆیە شیعرو بەستەم

2007-7-1 هەولێر



## گومانی دڵ

دڵ خەریکە،گومان بکا،
لەڕەفتارو لەگوفتارت
هەررۆژەو،
بەچەشنێ دەدوێ
لەباسی خۆت و،ئاکارت
گەلێ جاران...
پڕئازارن ووشەکانت.
خوێن لەهەستم ،
دەچۆڕێنی
بۆواناکەی بەدیدارت
چۆک بەکێوی گومان بێنی

2007-7-4 هەولێر

# کانی ئەشقت شێلوڕەنگە

من دەزانم تۆجوانی،
جوانیت جوانی چرایەکە،
بۆشەوێکی ئەنگوستەچاو.

من دەزانم تۆشازادەی،
لەبازاڕی ئەشقی ئەمڕۆ،
دا هێنەری ...
نازومەکرێکی نەبڕاو.

کەدێیتەگۆ،
فەیلەسوفی،
لەباسی ئەشق ودڵداری
نەیاسا ناس،
نەڕۆشن بیر
ووشەی وەک تۆی،
دێتەزاری.

بەڵام سەد ئاخ !!
چرات ڕێگای،
تاریک ڕوناک ناکاتەوە

شازادەیت...



لەبازاڕی، ئاشقانی
هەست و نەست پاک
پارەی خۆشی ناکاتەوە.!

ووشەکانت لەیاسادا
لەفەرهەنگی،
ڕۆشنبیرانی دونیاشدا
هیچ شاعیرێ...
دەرگای لەسەر ناکاتەوە.!

چونکەجوانیت،
وەکو گوڵی بێ بۆن وایە
هەربۆنی کەبۆنی نایە

کانی ئەشقت
وەکو ئاوی بەفری تواوە
شێلو ڕەنگە

کێ بێ دەمی پێوەدەنێ
چونکەلای تۆ،
فەرقی نییە
ڕەنگ، هەر ڕەنگە...

2007-7-4 هەولێر

## هەرچەند ڕازەکانم دەهۆنمەوە

ئەم شەو،هەرچەند
ڕازەکانم دەهۆنمەوە،
بۆچرکەیەک،
مەودای دووری خەیاڵەکان
ئارام نابن...

بۆکێ سەریان پێ هەڵ دەگرم
وەکومناڵێکی شیر مژە
دەگرێن وپێم ژیر نابن

هەرچرکەیەک
لەژیانم خۆی ڕازێکە
هەرڕازێکیش...
بەدوای چاوی ڕازێ وێڵە.

ڕودەکەمە،
هەردەریایێ...
هەرڕوبارێ ...
هەرکانیێ...
چۆڕەئاوی، هەربن بەردێ
ناخورێتەوە،هەموی لێڵە.



ئاخ چۆن سەرم
کەوتۆتەنێو دەریای گێژاو
هەتالێوم نوقمی خەمن،
ڕازەکانم.

چ بارێکەلەسەرپشتم
بێ ڕەحمانە،وادام دەگرێ و،
هەنگاو دەنێم ،
بەس ناتوانم.

بێ ئومێدی،
بەتەواوی سڕی کردوم
تروسکایی
نییە، لەنێودەرونی من...

خۆزگەبێ پەردەدەمزانی
مانا ی چییەلەم ژیانە،
جا بونی من ...

هەولێر
2007-7-6

## لەفەرهەنگی شەوێکی پڕئەستێرەدا

ئەم شەو ویستم،!!
چرایەک بۆ تاریکی ڕێت،
داگیرسێنم...
لەفەرهەنگی،نیوەشەودا
کام ئەستێرەپڕشنگدارە
بانگی بکەم،ڕازی دڵم
بەبێ پەردەلەحزوری،
بدرکێنم...

لەم شەوەدا...
کامەووشەبریسکەدارە
کامەووشە،
لەناسکی و لەهێمنی،
لەنێو هەموو ووشان دیارە
بەم ووشەیە،
ناوی تۆی پێ بنەخشێنم

هەرچەند ڕێگای،
گەین بەتۆ،
دوورو درێژبێ
بەڵێن بدەم... بۆ وچانێ
دانەمێنم .



هەوراز نشێو...
ئاستەنگ نەبێ، بۆ گەینت
دڵ نیابی واز نەهێنم

من بەڵێنت هەر پێ دەدەم
گەر ئەستێرەم ،
دەست گیر نەبون،
لەم شەوەدا،
دانا مێنم..
.بێ دو دڵی
هەتاو هەڵ دێ
نەک لەزیندان
لەناوگڕیش حەشار درابێ،
دەت دۆزمەوەو، دەرت دێنم
دڵ نیابە... لەپێناوت
دەست بۆپشکۆی گڕیش دێنم

هەولێر 2007-7-13

## ئاهی ژوانێکی کۆن

ئەم شەو ئاهی،
ژوانێکی کۆن،
لەناخەوە،
دەم خواتەوە

ئەوخوێناوەی،
لەم ژوانەدا،لەبرینم هات
تازەدەگاتەکا سەوە

هەرخۆیەتی...
وەکو جاران،
هەر بەمەستی
لەخەیاڵم گوزەر دەکا

پێک لەبادەی لێوی ئاڵی
خوانی سینەی،
سێو و نارنج...
پێش کەش دەکا

((شوکور بۆخوا))
ئێستا دڵم بۆ ژوانی
دەڵێی بەردە...



لەهەرشوێنی،بێتەسەر ڕێم
بێ دو دڵی من پێی دەڵێم
ڕێم بۆ بەردە

هەولێر 2007-7-17

## ئاڵای کوردستان

زۆر دڵ شادم،
کەدەت بینم
لەئاسمانی وولاَتەکەم
شنەی شەماڵ
دەت شەکێنێ

چرای چاوم...
چ باڵایەک
وەک باڵای تۆ
لەئاسماندا
ئەو هەمو جوانییەدەنوێنێ

لەدیدەمدا...
هێندەبەرزی
بەبارتەقای،
بەرزی ئاسمان
لەبەرزی باڵات دەڕوانم

چقڵی چاوی دوژمنانی
ئەی ئاڵاکەم...
لەهەڵ دانی،چوارچراوە
چاک دەزانم

ئەی ئاڵاکەم
لەئێستاوە، لەداهاتوش



ئەوکەسانەی
بەمانگی ڕوی تۆ دەوەڕن

کەدێنەگۆ
لەباسی تۆ و ، نیشتمانم
بەئاسماندا، دەحەپن و
زمان شڕن...

ئەی ئا لاکەم...
ئەی هەتاوی... باڵا بەرزی
ڕێگای ژینم،
هێمای بون و نەبونی من

دڵ نیابە...
ڕۆژێ دا دێ،
بۆنی زێڕی ڕەش لەخاکت
دوژمنانت، بانگ هێشت دەکا
بۆ لێستنەوەی جوتێ سۆڵی
پینەپینەی...
منا لێکی
شەرواڵ دڕاوی وولاَتی من...

ئەوسا ئەتۆش
هەربەبەرزی...
لەئاسمانی
کوردستانم دەبشنێوە

هەولێر 2007-7-22

## تیشکی چاوت

تیشکی چاوت،
وەکو هەورێکی پڕ باران
لەناکاو، ئیمڕۆ داباری
هەست و گیانی لێ تەڕکردم

هێند تامەزرۆی دابارین بوو، !
بروسک ئاسا...
دڵی پێدا م،
مەستی کردم

چ مەستیێ،
لەمەستی چاوی خۆی مەست تر
لەتەبایی ئەگریجەکەی،
زۆر تەباتر

گیانی منی،
کردەنیشان.
تیر لەسەر تیر
لەنێوچەقی، ڕۆحمی دەدا
تیر لەسەرتیر،
لەناوەندی دڵمی، دەدا



زۆرنەمابوو،
خوێن لەجێگای،
تیربچۆڕێ...
واپێ دەچو،
نیشان شکێن...
ئاراستەی تیر
بۆلا یەکی تر بگۆڕێ

بۆیەمنیش...
هەردەمو دەست،
چەترم هەڵ دا

لێ نەگەڕام
ئەوبارانەی،
ئاوا بەگوڕ دادەباری
چیتر تەڕم بکاو،
لێم دا...

هەولێر -2007 7-25

# چ ڕوی داوە

چ ڕوی داوە،
تۆ تادوێنێ
سۆمای چاوی
ماندوی من بوی.

((کوختییەک بووی-
هەمورۆژێ،گۆرانیت بۆ،
ئەشقم ئەگوت )).

هەمورۆژێ،
بەناو گڕدا دەهاتی و،
لەسێ بەرم ،
جەستەت فێنک،
دەکردەوە...

گوێچکەکانت ڕاهێنابوو،
هەمورۆژێ
شیعرێکی نوێ ببیستن و،
دەرگا بۆخەم نەکەنەوە.

ئەدی ئێستا بۆ ناپرسی،؟
چۆن ژیانم ، بەسەردەبەم ؟



چۆن شەو تەنگم پێ هەڵ دەچنێو
چاو ناچتەخەو؟
تابەیانی یادگاریەکان
لەبەرچاوم پەخش دەکەم
لەیەکەم ژوان تادواین ژوان –
فەرشی سوریان بۆ ڕادەخەم
تائێستاشی لەگەڵ دابێ
هەمورۆژێ شەقامەکان
دەپێومەوە...
دەچمەوەژێر ئەودارانەی
بەنیاز بوین،
یەکەم ماچی
خۆشەویستی لەوێ بکەین
سۆزو وەفاو-
پەیمان بەیەک بدەین

بەڵام،
ئێستا، لەمن ونی
چرای چاوم کز دەسوتێ
هیچ شک نابەم،
لەم دۆزەخە،
دەرم بێنی...
نییەدەستێ

چونکەئازیز
خۆشەویستیت،

هێندەلەلای من گەورەیە
دڵم بەقەد،
هەمو دونیا ش فراوان بێ
من دڵ نیام
هێشتا جێگات نابێتەوە.....

2007-7-29 هەولێر



## ڕوخساری تۆ وای لەمن کرد

ڕوخساری تۆ وای لەمن کرد،!
کەئاماژەی،
چاوەکانت،بدەمەوە

ئەوتیرانەی،
لەچاوی تۆ وە،دەردەچو
باوەشیان بۆ بکەمەوە

تامەزرۆم بوو،
یەکەم تیرت...
هەست وسۆزی هێنامەجۆش

یەکەم شوێنی دیدارمان
بۆ من بو وە،
بەهەشتێکی ئارام و خۆش

2007-8-5 هەولێر

## خۆت لێم ون کەی ناژییێم دەمرم

نەکەی ، ئازیز خۆت لێم ون کەی
شارەو شارت ، بۆ بگەڕێم
داخێک بنێی بەجەرگمەوە،
چاوەڕێ بم هەر بڵێی دێم .
تۆ خۆت هاتی  دڵت پێم دا،
خوا هەڵ ناگرێ وام لێ بکەی...
بەحەسرەت و ، دەردی دوریت
دۆ زەخێکم بۆ بەرپا کەی...
ژیانی   من ،   بشێوێنی
نەتوانم هیچ ڕێگا بگرم
کە لەو شوێنەی، ئەتۆم ناسی
بۆ ئەبەدی ئێشک بگرم
نەوەک یەکێ لەبەرچاوم،
شوێن پێ کانت ڕەش کاتەوە...
تریفەی مانگی ڕوی جوانت
لەبەرچاوم کاڵ کاتەوە...
دڵ نیابە، تاسەر ئێسقان
خۆشەویستیت چۆتەدڵم
نەکەی ئاوا،  بەئاسانی
بەجێم بێڵی ئاخر گوڵم
چونکە، دڵم تازەبەتۆ،
ئاشق بو وەو ئارام ناگرێ
دڵ نیابە، بەجێی بێڵی
بۆ ساتێکیش ناژیێ و دەمرێ.

2007-8-5 هەولێر



## پێ کی ژەهرت بەدیاری بۆ من جێ هێشت

بۆچی  بارگەت وازو تێک نا ،
هەولێریشت،
زو بەجێ هێشت.؟
لەم سەفەرەت،
پێکی ژەهرت ئامادەکرد،
بەدیاری،بۆ منت جێ هێشت...

گەردەت زانی ،
دڵت(( لانەی)) ئەشقم نابێ
بۆچی دەرگات،
لەسەرئەشقی من کردەوە؟
ناو نیشانی خۆت بەمن داو،
بێ دودڵی...
کۆدی دڵمت زو کردەوە؟؟

نەت دەزانی دڵم  پڕی،
میهروسۆزە
هەتا سەرلێو،
ئەشقی جوانی و نازت دەبێ ؟
نەت دەزانی،
خۆشەویستیم،باڵدار ێکە
زو دەستەمۆی ((خەندەدەبێ)) ؟؟

ئێستاش گیانە،
پێکی ژەهرت،
لەدواین ڕۆژ پێ نۆش کردم
دواین چرکە،
بەهەناسەی((سلێمانیت))
ئاشنا کردم.

هەڵی مژم
دڵ نیات کردم دۆزەخە!
بێ هەناسەش
خۆمن ناژیم،
دەرگای هەناسەم دامەخە
بۆ پێم ناڵێی چی بکەم ئێستا
ئەشقت تێ کەڵ خوێنم بو وە
چۆن دڵت دێ خۆت لێم ون کەی
((گوێچکەکانم ـ
کەهۆگری دەنگت بو وە))

2007-8-9 هەولێر



# هەناسەی تۆ

بەهەناسە،
مەحزونییەکەت...
ئاگرێکت لەگیان بەردام!
شەویش خەیاڵ دەی بردمەوە...

لەقوڵای هەناسەکەت
دۆزەخ بوتۆ،
بۆمنت سازدا
بم سوتێنیش،
باوەشت بۆدەکەمەوە.!

باوەشی من لانەی خۆتە
بەئارامی وەرەژوری و،
بەسوتانم خەم نەت گرێ

زۆرلەمێژەمن دەسوتێم
تائێستاکە...
یەکێ نەبو
دەست بەبرینی،
کۆن و ئێستای جەرگم بگرێ

2007-8-16 هەولێر

## کەی دێیتەوە

کەی دێیتەوەبۆ شارەکەم
شەقامەکان تا گوڵ ڕێژ کەم
شەقام شەقام بۆ پێشوا ز یت
چرای دڵم لێیان پێ کە م

*　　*　　*　　*

خاکی بەرپێی تۆ بێ دڵ م
من چاوەڕێم کەی دێی گوڵم
چاوەڕوانم زوبێیتەوە
وەکو بولبول بۆ سەرچڵم

*　　*　　*　　*

دوباڵندەی یەک لانەبین
بۆئامانجمان پەروانەبین
لەئاسمانی خۆشەویستی
د و ئا شقی شێ تا نە بین

*　　*　　*　　*

هەناسەمان تێکەڵ یەک کەین
بانگی خۆشەویستی بدەین
خۆشەویستییەک کەنەکرابێ
لەم گەردونەئێمەبی کەین

هەولێر 2007-8-17



## دیسان شەوهات

دیسان شەوهات
ئازار گیانم دەتەنێت و،
برینەکان وەک ئەستێرە،
لەشەوی تاری گیانی من،
وابەردەبن ،
لێ ناگەڕێن هەناسەشم_
بەئارامی لێ بێ تەدەر...

برینەکان بەیەکەوەکەدەبنەوە!!
ئاشقێکی شێتی خودار،برین برین،
خوێ دەکاتەبرینمەوە،!!
لەدورەوەش،
بەئاستەمێ
دەسرتێنتەگوێچکەکانم،
خۆشم دەوێی...

ئای کەشەویش...
لەجەنجاڵی،
خەیاڵی من چەند بێ زارەو،
ئەستێرەکانی،کەموژدەی
بەهارێێکی پڕ گوڵزاری_
لەوەرزێکی وشکانی دا،

بەگوێچکەدا دەچرپێنن...

* * *

ئای لەڕۆژگار...
لەبەهاردا،
ئاوا وەرزم وشکانی بێ
ئەبێ پایز گوڵی عومرم
بەچ دەردێک بووەرێنێ
بۆن و بەرامەی ئەم گوڵە
کێ بۆنی کا...
کێ لەسینەی بی خەوێنێ

2007-9-6 هەولێر



## ئەم شەو ئەشقت....

ئەم شەو، ئەشقت چی پێ کردم
تابەیانی گریا ن دمی!!

وەک پەروانەلەدەورت بووم،
تامانگی ڕووت سوتاندمی.

تاگزنگی هەتاو هەڵ هات،
لەهەمو شت تۆراندمی

لەنێو خوێن و خیزاوی دڵ
بەسەدان جار گەوزاندمی.

وەکو باران ئەشکت لێم ویست
ئای لەئەشقت تاساندمی.

یەک ووشەی تۆ مەستی کردم
لەناخەوەهەژاندمی.

کەپێت وتم خۆشم دەوێی
خۆشەویستیت بوو چاندمی.

2007-9-6 هەولێر

## ئەم شەوتۆمیوانی دڵی منبوی

لەناودڵم ،
ئەم شەوئازیز،
جێم بۆت داخست...
سەرینەکەت،
ڕوحی من بوو
لەم شەوەدا،سەرت پێی کرد...
پەتوەنەرمەکەی سەرسینگت
پەردەناسکەکانی،
سەردڵی من بوو
تۆی میوانی ،
لەباوەش کرد...
* * * *
هیچ نەوێرام ئەم شەو بنووم !!!
ووتم نەوەک
ناڵەو ترپەی،
دڵی شێتم بێ زارت کاو ،
لێ نەگەڕێ... تۆبخەوی .
ئێشکم گرت بەدیارتەوە
ووتم نەوەک ڕابچڵەکیت،
لەوخەوەدا
چونکەئازیز،
من دەم زانی
میوانێکی شیرین خەوی ...

هەولێر 2007-9-10



## ئەشق لەووڵاتی ئێمەهەروایە

دەستیان شکێ،!!
چۆن دڵیان هات...
پەنجەبۆ ڕوی ناسکت بەرن .

خەیاڵ خاون،
گەربتوانن تیشکی هەتاو،
بەناو لەپی بێ ژنگ بگرن .

ناسکی ڕوت...
مانگ ناتوانێ
ئارام بگرێ لەداوێنی

چۆن دەتوانن !
لێوی(( جوانت)) والێ بکەن
کەنەتوانێ ناوم بێ نی

ئارام بگرە...
ئەم کاروانە،
لەلای ئێمە
لەوەتەی هەیەهەروایە

((ئەمەئەشقە))
خۆشترین ڕۆژی
جەفایە

هەولێر 2007-9-12

## ئەی مانگ

ئەی مانگ،
هەموشەوێ،
سەیرت دەکەم
دڵ گیر مەبە.
خۆنامەوێ بگەمەلات

خۆنامەوێ،
داگیرت کەم
خاکت بۆخۆم
بکەم بەووڵات

نامەوێ بێم
بیمەنیوە
لەقەشەنگی و،
لەجوانی بەژن و باڵات

من هەر هێندەم لەتۆ دەوێ
لەورۆژانەیارم دێتن
کەبەرێ کەوت
موژدەم بدێ
پێم بڵێ هات

2007-9-14 هەولێر



## گەرڕوخسارم وا ببینی

گەرڕوخسارم وا ببینی،
زولفی سپی و،
ڕیشی سپیم تێک ئاڵاوە...

نەچاو هەڵ دێ وەکوجاران
نەمن شیعرم،
نەئەوە منی لەبیر ماوە..

بێ ئارامی تەواوناخی،
لەحەسرەتی،
ئەم چەند ڕۆژە،
لێ تەنیوم.

تادێ ڕەنگم زەرد تر دەبێ
بۆیەک تۆسقاڵ
ڕەنگی سوورم،
لەڕوخساری دا نەماوە...

2007-9-14 هەولێر

## دەترسم بەشێتیم ببینی

زۆردەترسم،!!
تادێیتەوەلەکوچەی شار
تۆبەشێتی من ببینی
خەڵکی هەمولەدوام بڕۆن
تۆش ڕوخسارم وابیبنی
بێ پەروایان...
لەدوای ئەوەی، شکاندیان
شوشەی دڵی پڕسۆزی تۆ
مانگ نایەتەئاسمانی من
ئەستێرەشی لێ نابینی

9-14 -2007 هەولێر



## چا وەکانت هێزو تینم پێ دەبەخشن

لەڕوا نینی چاوەکانت
نەترساوم
چاک دەزانم ،
چا وەکانت...
هێزو، تینم پێ دەبخشێ

لەهاتنی ڕێگای ژوان
نەترساوم
چاک دەزانم،
دڵی گەورەت...
هەرچی هەیتی پێم دەبەخشێ

بەڵام ڕووحم...
لەکامێرای، شەقامەکان
من دەترسم !!
وێنەکانمان ،
پەخش بکەن.

یادگاریەکانمان، بزڕێنن
ناوی تۆی پێ لەکەدار کەن

2007-9-22 هەولێر

## وام دەزانی لەنێو دڵت دام

وام دەزانی،
دارودیواری ژورەکەت،
وێنەی منە...
سەری زمان بنی زمان
کەدێیتەگۆ،
ناوی منە...
وام دەزانی،
هەمو شتی ئەم سروشتەت
بەناوی من ناو ناوە...
وێنەی منت،
لەناو چەقی دڵ داناوە
بەس نەم زانی...
ڕۆژێ دادێ،
بەمن دەڵێی وازبهێنە.
یاخەم بەردەو،
جارێکی تر ناوم مێنە.

2007-9-29 هەولێر



## هاوڕێم حەسەن

هاوڕێم حەسەن،
چەندەخۆش بو،
کەئەوشەوەی...
ڕابردومان بەیەکەوە،
بیری یەکتر دەخستەوە.

بەیەکەوەیادمان دەکرد
یادی یاران،هی ئازیزان
هی ئەوانەی...ووشەکانیان،
تائێستاشی لەگەڵ دابێ
لەمێشکمان دەخولێتەوە...

ئای شەوێکی چەندەخۆش بوو
دووتامەزرۆی،پاشی چەند ساڵ
بەیەک گەیاند...

بەیەکەوەتا درەنگانێ
خۆشەویستی و،
شیعر و،گوڵمان
وەکو لاو لا و...
تێک دەئاڵاند

2007-10-2 هەولێر

## بۆئەوینت ڕوحی خۆشم بەجێ دێڵم

من نامەوێ،
لەمەزیاتر، هۆگرم بی
نەوەک ئەشقم،
گوڵی عومرت بو وەرێنێ.

نەوەک گیانە...
بەم پایزە،
خشپەی گەڵای،
داری وەریوو.
ڕەشەبایەک
بۆبەها ری،
ژینت بێنێ.

بڕوابکە...!!
بەقەد هەموو، هیوای ژینم
چاوەکانی،
پڕ لەنازی تۆم خۆش دەوێ
بەڵام چی بکەم،!!
بارانێکی ناوەختەساڵ
وازو هەڵکاو،
هەوری ڕەشی بگر مێنێ،
تۆی لێم بووێ...



هۆگوڵەکەم...
خەیاڵ نەکەی
لەم پێ دەشتە...
لەژێر، لێزمەی
هیچ بارانێک بەجێت بێڵم.
دڵ نیابەدەبمەچەترو،
بۆ ئەوینت،
ڕووحی خۆشم بەجێ دێڵم.
2007-10-5 هەولێر

# ئەگەر ئەم جارەبێیتەوە

ئەگەر ئەم جارەبێیتەوە،
وەکو جاران !
شنەی دەنگت،
بێتەوەگوێم...

بۆپێش وازیت،
بۆدیدارت،
مەرگ بانگم بکا هەردێم...

هەرچیم هەیە،
دەی دەم خەڵات
بەس دەنگی تۆ
ببیستمەوە...

بەس ئەم جارە،
وەکو پێشتر،
بەدڵی شکاو...
سۆزی دەنگت  نەبیستمەوە

چونکەخۆشەویستیت گیانە
هێندەقوڵە،
لەژیانم



تاسەر ئێسقان

سۆزی دەنگت
شنەی ڕوحە
وەبەر لێوم دێنێتەوە،
بزەی ژیان

2007-10-6 هەولێر

# سبەی جەژنە

سبەی جەژنە،
کێ سەبوریم  بداتەوە
کەنەتوانم ،
ماچێک بکەم لەلێوی ئاڵ

کەنەتوانم ،
باوەشی کەم ...
تاکەی تەمەن ئاوا بڕوا،
بکەومەسەر،
سینەی خەیاڵ .

چ خەیاڵێ...
هەموشەوێ
وەکو لاو لاو،
خۆی لەهەمو پیرۆزییەکم،
دەئاڵێنێ.

ئای لەم جەژنەش،!!
چەند دڵ تەنگم...
لەئێستاوە،
لێوی تینوم،
بۆ جەژنانەی،
لێوەکانی دەناڵێنێ .

هەولێر   2007-10-11



# بەخەیاڵم دانەدەهات

بەخەیاڵم دانەدەهات،
ڕۆژێ دابێ
لەگەڵ ئەشقا،
دەست لێک بەردەین.!!
بەئەشق بڵێم ماڵ ئاوا،
وەک دوو کەنار...
بەیەک ناگەین.

من لەئەشقا،
فێری سۆزوو،
پەرستن و ڕاست گۆیی بووم
بۆیەئەشقت بو بەقیبلەم ،
سوێندم پێی خوارد
دایم حەوداڵی ڕاستی بووم.
من دەزانم تاوان دەکەم،
دەرحەق بەتۆ
گەر، لە ئەشقت
دوور کەومەوە
بڕیار بدەم،
بەیەک جاری
دەرگای دڵم داخەمەوە
بەس ناچارم لەژیانم

لەگەڵ ئەشقا
دەست لێک بەردەین
بۆ دواین جار
ببورەلێم
بڕیارێکی گەلێ سەختە
بەڵام چی بکەم ،
لەدەست ڕۆ ژگار ...

2007-10-15 هەولێر



## لێت دادەبڕێم بەس بم بورە

ببورەلێم،
بۆبڕیاری لێک دابڕان ،!!
کەپێم ووتی ...
قوڕگم،
پڕببوو لەگریان .

بەڵام چی بکەم
ئەگەرقەدەر،
لەژییانمان وا بخوازێ

خۆ دەزانم بەم بڕیارەم،
مەرگ دێت و،
من دەخوازێ ...

2007-10-16 هەولێر

# کەیەکەم جار ئەتۆم بینیی

ئێستاش دەچمەوەئەوشوێنەی
کەیەکەم جار ئەتۆم بینی
کەیەکەم جار دڵمان پێک دا
وامان زانی خەومان بینی

هەمورۆژێ وەک یەکەم جار
سەرێ بەوشوێنەدادەگرم
لەگەڵ بینینی ئەوشوێنە
دەگریێم وخۆم ڕاناگرم

بەفرمێسکی چاوەکانم
لافاوی خەم بەرپا دەکەم
لەدوای ژیان هەرمردنە
من ئێستاکەجاڕێ دەدەم

پێم خۆش بوو دایم لەلات بام
وەکو سێ بەر بەدواتەوە
چرای شەوی تاریکت بام
نەک لێوی خەم بت خواتەوە

بە لام چی بکەم ترسی ڕۆژگار
هەمو تەمەن دەشێوێنێ
من نامەوێ ئەوئەشقەمان
گوڵی عومرت بو وەرێنێ

2007-10-17 هەولێر



# چیت پێ بڵێم

چیت پێ بڵێم ،
لەوڕۆژەوەی تۆم ناسیو ە
لەوڕۆ ژەوەی،
نیگای چاوت
وەک ڕنەی باز
دڵی منی دادڕیوە...
من ناتوانم لەتۆ زیاتر
بۆ هیچ کەسێ،
بنوسم و بڵێمەوە
وانەی ئەشق و،
ئەڤینداری
بخوێنمەوە...

2007-10-22 هەولێر

# ڕەهێڵەی خەم

وارِەهێڵەی خەمان دای کرد
کوانێ باران وادا دەکا
کوانێ باران بەداباریں
پێ دەشت و کێو ڕوتەن دەکا
داباریني خەمی ئەمرِۆ
چاوەکانم واڵێڵ دەکا
ئیدیای مەرگم لەپێش چاوی
بێ دوو دڵی پەخش دەکا

2007-10-23 هەولێر



# باڵای ئەشقم دەڕمێنی

دەی ڕمێنی ،
باڵای ئەشقی وەفاداریم
دەی سوتێنی،
هەست و سۆزی پڕدڵداریم

دڵداریەک،
کەباڵاکەی لەهەورایە
وەفایەکیش
کەبەوتن باسی نایە

من تێ ناگەم
تۆ چۆن ئەشق دەخوێنیەوە.؟
تۆ چۆن سۆزی،
شیعرەکانم دەهۆنییەوە.؟

خۆدەزانم ،
چەنەم شل بو،لەمن ناگەی!!
بەدڵ پاکی_
سۆزی ئەشقم پەنا نادەی

من تا دەمرم،
باڵای ئەشقم بونیات دەنێم
بەڕاست گۆیم،
بۆکێ بچم ڕوناکەڕێم

2007-10-26 هەولێر

## لەدوری تۆ وەڕس نابم!!

هەرچەند دوری
قەت ،
لەدوریت وەڕس نابم !

وادەزانم لەگەڵم دای،
بۆیەهەرگیز لێت تێر نابم.

قەت تێر نابم
لەوشەی شیرین...
لەگفتو گۆت
کەباس دەکەی،
سروشتی خۆت

منیش وەک تۆ ،
ئەشق ماڵمە...
ئاسمانی شین،
بیری باڵمە...

هەولێر 2007-10-26



## وام لێ مەکەپەشیمان بم

وام لێ مەکە،
پەنجەی،
پەشیمانی خۆمت
بۆبشکێنم.!!

ماڵی دڵم، لەتۆچۆڵ کەم،
وام لێ بکەی،
ناوت نێنم .!!

ئەوپێ نوسەی،
هەموڕۆژێ،
شیعری جوانی بۆ دەنوسی،
بی شکێنم .!!

بۆئەبەدی
لەوێرانەماڵی خۆمدا
بەتەنهایی هەربمێنم

لەلێدانی ترپەی دڵم،
بێ زاربم،
دەست بەقژی
ئازارێکیان

دانەهێنم.

نەم دەزانی
دەبییەخەم و،
دەبییەکۆستێک ... بۆژیانم
نەم دەزانی
دەبییەبرین...
لەسەردڵی ،
نەرم و نیانم

چ برینێک...
چارەناکرێت، بۆ ئەبەدی
چ ئازارێک...
تاکو ئێستا،!
بەم شێوەی خۆم...
کەسم نەدی

بەمن ناڵێی
چی وەڵامی،
دڵی پڕ ژان بدەمەوە؟
بەمن ناڵێی
چی وەڵامی ،
پێ نوسەکەی خۆم دەمەوە؟؟؟

قسەکانت هەموی ما ون
یەک بەیەکی، تۆمار کراون



کەدوبارە...
گوێیان بۆ هەڵ دەخەمەوە
لەشەرمانە
چاویشیان لێم ناکەنەوە

کەتۆ دەت گووت
مەرگم پێشی ،
مەرگت کەوێ .
گوێم لەشیعرەکانت نەبێ
دڵ ناسرەوێ

هیوات دەخواست،
لەتەمەنت...
خودا هەڵ گرێ
بی خاتەسەرتەمەنی من
هیوات دەخواست،
ڕۆژێک شادبی...
بۆ یەک جاریش
خۆت باوێیتەباوەشی من

بەڵام ئێستا
هەمو شتێک، لەژیان و ،
لەیادگاری و ئەشقم گۆڕا
دڵ نیابە
ئەو گرەوەی لەئەشقم دا ـ

کەخۆت دەت ویست بی بەیتەوە
هەموی دۆڕا...
هەموی دۆڕا...
هەموی دۆ ڕا...

هەولێر 2007-10-27



## دەڵێی لەخەم لەدایک بووم

گەلێ جاران،دەرگای دڵم
دادەخەم و،
لەهەموشت خاڵی دەکەم.
من نازانم ،
لەکوێ وەدێ ،
دەم دۆ زتەوە،شاڵاوی خەم.

شوکور خوایە...
دەڵێی لەخەم لەدایک بووم ،
هەربۆ خەمیش هاتومەبوون.
هەر خەمیشە
هۆشم دەبا بەرەو ون بوون

خەمم وەکو،
خەمی هیچ کەس،
نییەلەژیان
کوانێ ژینم...
ژیانێکی پڕ هەنسک و
پڕ لەگریان.

ڕۆژێ یادی ئازیزانم ،
کردویانەسەفەری مەرگ

ڕۆژی یادی بێ وەفایان
چەند جاردڵیان
کردومەتەنگ

قوربان خوایە
دەهۆشێکم پێ ببەخشە
تالەژینا...
خۆم پێی شادبم
یالەوژینەڕزگارم کە
بۆ وا لەژێر خەمی دابم

هەولێر 2007-10-28



## نەخشەی چاوم

تۆسەیری، چاوانم مەکە
بەنیازی چی،
چی لەچاوم ...دەدۆزییەوە.!!

چی لەشێوەم بەدی دەکەی
تۆبۆ ئاوا، وەکونەخشە
دەم خوێنییەوە.!!

نەخشەی چاوم
نەخشەیەکە
دڵ نییابەلەیەک هێلی،
سەردەرناکەی

بۆجارێکیش
کەس نەی توانیوەپێم بگا
تۆ چۆن دەتوانی پێم بگەی...

هەولێر 2007-10-30

## لەخەویشدا تۆهەر وازم لێ ناهێنی

لەخەویشدا،
تۆهەر وازم لێ ناهێنی !
بەسەئیتر...
ئەوئەشقەمان، بڕایەوە

ئەودڵەی، چەشنی پۆڵابوو
لەنێو کورەی ئەشقی تۆدا ،
تینی نەما
تووایەوە

بەسەئیتر
من نامەوێ گوێ بگرم
بێ هودەیەهات وچونت
مەیەخەوم

بێ زار دەبم لەخەویشدا
بێ وەفایەک...
لێم بزرێنی خەوی شەوم

2007-10-31 هەولێر



## بۆبێ زاری خۆم دەنوسم

لەبێ زاری خۆمدا ویستم،
هۆنراوەیەک ...
بهۆنمەوە.
کەمێک ئازارم وەلا نێم
لەم گەردوونە،
تا نەوایەک بدۆزمەوە.
بێ هودەبوو
لەسوچێکی ژورەکەمدا
هەر چەند ئەژنۆم _
لەباوەش گرت ...
تاوام لێ هات،
لاشەکەشم
سەری ماندوی ڕانەدەگرت

2007-11-1 هەولێر

## بەئەشقی تۆ و ەدەم نازی

بـەئـەشـقی تۆ وەدەم نازی
وام دەزانـــی شـــای یـارانـــم
بەرامبەر مانگ بێ پەروابووم
کەتۆم یاد دەکرد شـــەوانـــم
لەتیشکی ڕۆژیش بێ باک بووم
تـۆبـوی ڕونـاکـی چاوانـــم
زۆر بــەخــۆ مـم دادەنـــازی
تۆبوی یاری مـیـهـرەبـانـــم
ئای کەبێ بالاّت هەڵ ناکەم
ئەستێرەو مانگ و ئاســـمانم
پاش تۆ کەس ناتوانێ ژێر کـا
بارینی خوێـــن لەچـاوانــم
کەس نابێ تەجۆلاّنـەی دڵ
ژێـر کاتـەوەشیعرەکـانم

هەولێر   2007-11-3



## من گەردنت ئازادەکەم

تۆ گەردنم ئازا ناکەی
من گەردنت ئازا دەکەم
چۆن پەپولەگوڵ ماچ دەکا
من ئاوا لێوت ماچ دەکەم

ناوەرێنم پەڕەی گوڵت
پەڕەی گوڵت پەڕەی دڵمە
کەگەردنم ئازا ناکەی
باوانەکەم ئەمەزوڵمە

من کەشیعرم بۆت دەنوسی
وەکو بت بوی دەم پەرستی
بۆگەردنم ئازا ناکەی
بۆ پێم دەکەی دەستی دەستی

هەموڕۆژێ لەخەیاڵم
تۆشاگوڵی گوڵ زارم بوی
چۆن گەردنم ئازاناکەی
بەدەیان جار قوربانم بوی

خەندەی لێوت ئێستاش گیانە
وەکو جاران دێتەوەگوێم
کەگەردنم ئازاناکەی
گۆڕ هەڵکەنەتامنیش بێم

2007-11-3   هەولێر



## کەدەپرسن هاوڕێکانم

کەدەپرسن هاڕێکانم
چییەدیسان،
بۆ وا چاوت
بارانی خوێن دەبارێنی

بۆ زمانت نایەتەگۆ
هێند پەشێوی...
هیچ وشەیەک نادرکێنی

دادەمێنم ،
وەک کوختییەکی باڵ شکاو
بێ هێلانەو،هیوا بڕاو
دا دەمێنم

دادەمێنم
تابێ دەنگی،
لەناخەوەدەم خواتەوە...

تاهەنسک قوڕگم دەگرێ و،
دەرگای گریان دەکاتەوە...

دا دەمێنم، لەحزوریان

هیچ ووشەیەک نادرکێنم

بەیەک نیگا...
هاوڕێکانم،
لەبێ دەنگی و، زامەکانم
دەگەێنم ...........

2007-11-8 هەولێر



## چ ئاشقێک دڵی شادە

چ ئاشقێک دڵی شادە
منی ئاشق زۆر غەمگینم
بۆمن سوتاو و دڵ شکاو
مانگ بژمێرم و نەت بینم

بۆنەت بینم دڵ ئارام بێ
دیداری تۆ دڵ خۆش دەکا
ئاگادارنی دەردی دوریت
هەموڕۆژێ چیم پێ دەکا

لێ ناگەڕێی شەوبخەوم
خەوبەچاوم دادانایێ
دەنگت نەبیستم گشت ڕۆژێ
ئۆخەی بەگیانم دا نایێ

دەنگت بۆمن ئارامی یە
خەم وخەفەت وەلادەنێ
ڕزگارم کەهەتا زو وە
نەک هەواڵی مەرگمت دەنێ

2007-11-12 هەولێر

## بۆکۆچی ناوادەی تۆ

واساڵێکەسۆزی دەنگت،
نایەتەگوێم،
ڕوخساریشت،لەبەرچاوم
وەک خۆی ماوە...
نەگۆڕاوی لەبەرچاوم،!!
دڵ نیاشم ،قەت ناگۆڕێی
تاکو هۆگر،
لەم زەمینە،ژینی ماوە.
خۆزگەئێستاش،
وەک دواین جار،
دەم توانی دەستت ماچ کەم...
کەماچم کرد...
چیت پێ وتم
یادم ماوە.
تاقەگوڵ بوی،لەباغمان
بەس ئاخ (( پایز ))!
لەوەتەی هەی...
گوڵ بەبای تۆ هەڵ وەراوە...

هەولێر 2007-11-14

ئەم هۆنراوەیەبەبۆنەی ساڵوەگەڕی کۆچی دوای مامم
((جەمال )) نوسراوە



## چۆن پێت بڵێم خۆشم دەوێی؟؟؟

چیـت بۆبکەم، تابزانی خۆشـم دەوێـی
تـۆنـازانـی بـێ ئارامـم دڵ دەیـەوێـی...
کورەی ئەشقت، دەم سوتێنێ حاڵ وابڕوا
دەبێ کەی بێ ئەشقت بۆمـن بیتەنەوا.
باش بزانەخۆشم دەوێی، بەدڵ و بەگیان
هەناسەمی بێ تۆ ناژیم ئەی بەقوربـان.
بـۆ وانـاکـەی بەتۆشـاد بـم، بۆ ئەبەدی
ڕەحمێکـت بـێ  بزەیەکـم لـەتۆ نـەدی،
چاوەڕوانم گەر هەواڵـێک لـەتۆ وەبـێ،
بێ دەنگی تۆ دەم کوژێتن ،گەر وانەبـێ

هەولێر 2007-11-19

## بەناو زیندووم

خەڵک هەموی لەمن گەیی،
ئەشقی تۆیەوای لێ کردووم...
هەمو دەمێک گۆ شەگیر بم !
تەنها بەناو ئێستا زیندووم...
بەناو زیندووم لەم ژیانە،
لەدوای ئەوەی خۆشم ویستووی،
نەم دەزانی دەبییە ئاگر
ئیستا لەگییانم وا بەربووی...
چۆن یەکەم جارخۆشم ویستووی،
وەک خۆت ماوی  لەبەر چا وم.
بەس هیچ ئەشقێک وەک ئەشقی تۆ،
ئاخی پێ هەڵ ، نەکێشا وم.!!
پێت هەڵ کێشا م ئا خ و حەسرەت،
دەردی  دووریت، هەر دەم  کو ژێ...
بێ جگەلەتۆ  قبوو ڵ  ناکەم،!!
ئەگەر  مردم  کەس بم نێژێ !!!

2007-11-20     هەولێر

## لەحەسرەتی ....

لەحەسرەتی، ماچی لێوت
لێوی خۆم گەست .
خوێن لەلێوە کانم تکا...
چ زاڵمی،
خوێنی لێومت پێ حەلاڵ لە،
لەجیاتی مەی،
بۆ لێوی خۆت
تا نۆ شی کا.....
نەک خوێنی لێو،
هانێ هی(( دڵ )) ،
گەردەزانی لێوی تینوت،
بەو چۆڕەخوێنەی کەماوە،
ئۆخەی دەکا....

2007-11-22   هەولێر

## بۆ ئێوەی ژن

کەدەبینم،
خونچەیەکتان دەوەرێنن،
گوڵ لەیاخەی،
مێژووی... خانزاد#...
دەژاکێنن.
لەشەرمانا دەتوێمەوە،!
دەتوێمەوە،
وەکوبەفری سەرچیبایەک
کەماڵەکەی،هەمو دەمێ
دەکەوتەبەر،
تیشکی هەتاو...
بەنیگایێ،
دەبتەوەئاو...

# مەبەست خانزادی سۆرانە

هەولێر 2007-11-25



## دڵم ئێستاش ...

دڵم ئێستاش،
دەرگای ،ماڵی کراوەیە،!
هەرکاتێک ،
ویستت بێیتەوە...
چۆن ئەشقی تۆ لەبیر دەکرێ،
برینێکە،
هەمورۆژێ دەکولێتەوە...
دەبا لاڵ بم
چۆن پێم ووتی،
کۆتایی بێ،
ئەشقی ئێمەببڕێتەوە.
نەم دەزانی،
وادەشێوێم...
کەڕوخساو،
ووشەکانتم بیر بێتەوە...
پەشیمانم ...
هەزار کەڕەت پەشیمانم
لەوەی ووتم دەرهەق بەتۆ
دڵم ئێستاش،
دەرگای،ماڵی کراوەیە،
هەرکاتێک،
ویستت بێیتەوە...

هەولێر 2007-11-26

# کانی ووشەم

زۆر دەترسم،!
کانی ووشەم ووشک بکا،
لەدوای ئەوەی ...
تۆم ڕەنجاند و،
دڵت شکا .
تۆ سەرچاوەی،
ئیلهامی گشت شیعرەکانمی ،
تۆ هەناسەی پاکی ڕۆژی ،
گەردەلول و غوبارمی ...

2007-12-1 هەولێر



# بەنیازم لەبیرت کەم!!!

بەنیازم لەبیرت کەم !!
لەنێودڵمدا، دەرت کەم...
حەیفە،ئەشقی دڵێکی پاک
بەئەشقی تۆ وە،پیری کەم.
❊ ❊ ❊
وەر ز ی دڵم بەهاری بوو،
سەرچاوەی خۆشی و، شادی بوو،
بوی بەپایز، داگیرت کرد...
ئەو ئەشقەی پڕ،یادگاری بوو...
❊ ❊ ❊
نەم دەزانی وابێ پەروای،
پڕ نهێنی و، ڕازو سەودای...
گاڵتەت دێتن بەئەشقی من،
منیش وام دەزانی ،چرای...
❊ ❊ ❊
وام دەزانی چرای شەوی
بۆ ئەشقی من ، مانگەشەوی
ئەشقێک چرای تۆی لەڕێ بێ،
هەرگیز ئالاکەی ناکەوی...
❊ ❊ ❊
بەڵام ئێستا زانیم کەتۆ،
دەریایەکی ،پڕ لەدرۆ...!
بەنیازبوی بخنکێنی،
ئا شقێکی پاکی ڕاست گۆ...

2007-12-5 هەولێر

## بەتۆنەبێ ....

بەتۆنەبێ،دڵم، بەهیچ
نابێ تەوەلەم ژیانە
تۆی زاڵمیش، هەموڕۆژێ،
بەچەشنێ دەگری بەهانە...
خۆزگەئەتۆم نەناسی باو،
لەژیانم تۆم نەدیبا .!!
کەغافڵ بوم لەتەمەنم،
بەئاسانی دامەدەست با...
تازەتەمەن نایەتەوە،
بۆپێشەوەوامل دەنێ...
پەشیمانی تازەدوای چی
یادگاریەکان چیم دەدەنێ ...
لەخەم زیاتر بڕواناکەم،
هیچ دەرگایەک بکاتەوە،
ڕۆژێ دادێ ئەویش وەک تۆ
ئەشقمی ،لاکاڵ بێتەوە...

2007-12-1 هەولێر



## بەسەئەی دڵ!!

بەسەئەی دڵ،خۆت ڕزیو کرد،
دامەمێنە،بۆیادی ئەو بێ وەفایە.!!
کۆتو بەندی ئەوفرێ دە،
باڵدارێکی،ئاسمانییەو،
پڕسەودایە.
بەسەئەی دڵ،
چیتر(بازی) خۆت هەڵ مەدە
بۆدیداریشی مەی نێرە.!
دیداری ئەو...
تۆتێرناکا
ئەولەمێژە،
بەدیداری ڕاوچیان فێرە...
بەسەئەی دڵ،
ڕێگا بدەئەقڵ زاڵ بێ،
ئەوگوڵێکەبۆن کراوە،
گوڵێ جارێ بۆن کرابێ
سۆزو وەفا،
لەناخی دا هەڵ وەراوە...

2007-12-3 هەولێر

## ببەچرام...

ئەم شەو خەندەلەسەرلێوم
وەک پەپولەسەمای دەکر د
با سی جوانی و ڕازەکا نی
بۆ دڵێکی سو تا و دەکرد

دەی کرد باسی خۆ شەویستی
باسی ئەشق و جوا ن پەرستی
باسی وەفاو سۆ زو هەستی
باسی جوانی چاوی مەستی

ئای چەندخۆش بو ئەم شەو بۆمن
کەبەڵێنی ئەشقت پێ دام
بەڵێنتدا خۆشمت بوێ
تا هەتایەبیبەچرام

2007-12-9 هەولێر



## خۆزگەئێستا....

خۆز گەئێستا،
لەکەناری دەریایەک باین،
دڵمان بۆیەک، بکرد باوە.
لەباوەشی یەکتردابایین لەوکەنارە
ڕازەکانمان . بۆیەکتری گێڕاباوە!!

لەمن مەگرە،ئاخر گوڵم
گەر وڕێنەی ئاوا دەکەم...
گەر لەتاوی،
دڵی شێتی بێ قەرارم،
بەرام بەرت خەتا دەکەم ...

تۆنازانی، ئێستا ئەشقت،
ئاگرێکەهەمو ڕۆژێ دەم سوتێنێ.
هەمو ڕۆژێ، ئەشکی سورم،
لەچاوانی دەبارێنێ .

لەڕۆژێکا، بۆچەندین جار
لەتاو ئەشقت،
دەمرم و دەژێمەوە...
چەشنی مۆمێ،
لەناخەوە، هەڵم دەکەی ،

دەتوێمەوە...

ڕاستەگوڵم تۆ نازانی،
تۆ هەر خەندەت لەسەر لێوە.
دەردی دوریت هەر دەم کو ژێ،
ئەمن لێرەتۆش لەوێ وە...

ئاخر گیانە،
بۆیەدەڵێم ،
لەکەناری دەریایەک باین،
دڵمان بۆ یەک بکرد باوە.
چ ئازاری ئەشقم هەبو،
لەباوەشت.
بەماچێکت سڕی باوە
سڕی باوە

هەولێر 2007-12-9



## ((چیتر بەگوڵ نات ناسێنم))

لەزۆردێڕان،
لەوشیعرانەی، بۆم نوسیوی
بەگوڵ گیانەناوم بردوی،
بۆیەگوڵم،خۆش ویستوە،
لەبەرچاوم تۆ بەئەوچوی.
بەڵام گیانە،
پەشیمانم،بەگوڵم دانای،!
خۆ دەش زانم،
کت و مت وای...
بێ شکم من...
تۆ لەئەویش ناسکتری
لەشای گوڵانیش دڵ بەرتری.
بەڵام گیانەگوڵێکم دی،
لەبەرچاوی من هەڵ وەری،
بێ زەییانەبای پایز هات
لق و پۆپی هەموی بڕی...
بۆیەگیانە،
ترسی ئەوەم لێ نیشتو وە
گوڵم وادی زراوم چو وە،
هەرلەوڕۆوەبەڵێنم دا،
چیتر بەگوڵ ناوت نێنم.
لەنێو دێری شیعرەکانم

چیتر بەگوڵ نەت ناسێنم.
نەوەک ئەتۆش،
لەبەرچاوم، بو وەرێنن،
پەڕەی ژینت،
یەک بەیەکی بسوتێنن.
هەرلەورۆ وە،بڕیارم دا،
تابمێنم.!!!
((لەڕوحی خۆم زیاترگیانە،
بەهیچی تر نەت شوپهێنم))

بیرۆکەی ئەم شیعرەم لەشیعرێکی شاعیری گەورە((عبداللەپەشێو)) وەرگرتوەبەناوی ( ڕامانێک )

2007-12-10 هەولێر



## بۆنی مەرگی خۆم دەکەم

ئەم ڕۆ ئازیز
بۆنی گوڵی عومرم دەکەم،
واهەست دەکەم،
بۆنی مەرگ. لەعومرم دێ،
بای ئەجەلم، لێ نزیکە،
شنەشنی،
بەرەو هەواری ئێرەدێ ...
بۆیەئازیز ،تکام وایە
بەرلەوادەی ،
ئەو ئەجەلەئەتۆ وەرە.!
ڕوحم لەگەڵ خۆتا ببەو،
کەبێ زارەو،
پڕ کەسەرە.
بەتۆ نەبێ ئەوڕوحەی من،
لەگەڵ هیچ کەسدا، ناسازێ،
لەگەڵ تۆ دا نەک بۆ بەهەشت،
بۆ دۆزەخیش تۆپێی بڵێی،
دڵ نیابەلەگەڵت دێ ...

2007-12-11 هەولێر

# کەنەت زانی ...

کەنەت زانی،
ئەشق چییە...
بۆخۆت دایەدەستی ئەشق و،
دەستی قەدەر،
تا بەمنت بناسێنێ...
نەت دەزانی،
خۆشەویستی لەم وولاتە
پێ دەشتێکی سەڕاببیە،
بۆ چۆڕێ ئاو ... دەت خنکێنێ ؟؟

ئاخ بۆ ئەشقت ،!!!
بەسۆزەوە،
پێشوازیم کرد ...
بەتاسەوەباوەشم کرد...
بەڵام ئەتۆ،
بزەی لێوت لەمن تۆراند،
کفرت پێم کرد،
تاخوداشت لەمن ڕەنجاند...

2007-12-12 هەولێر



# قەت ناتوانم...

خۆ دەتوانم، ،
لەهەمو شت یاخی ببم...
لەتری فەی مانگ،
تیشکی هەتاو،
لەبنارو کێو،
لەدەشتای،
لەهەمو شت لەم ژییانە،
بەڵام گیانە،
تەنها لەتۆ،
قەت ناتوانم یاخی ببم .
قەت ناتوانم،
بۆ ساتێکیش بەبێ خەندەو،
بێ خەندەی تۆ،
ئەمن ببم...

2007-12-12 هەولێر

## من نهێنیت نادرکێنم

تۆ هەروابە...
بەدڵی خۆت بڕیار بدە،
من نهێنیت نادرکێنم .
تۆ دەستەمۆی خەمت کردم،!
خەمەکانیش ،
لەنهێنی ڕادەهێنم ...
مەگەر، تەنها دابنیشم،
خەمی دەردی جودایی تۆ،
بدەمەوە.
ئەو ڕۆژانەی خۆشم ویستوی
لەناخمدا بەنهێنی، بیگێڕمەوە...
دڵ نیبابەڵێ ناگەڕێم،
نهێنیمان لەوئەشقەدا،
کەس بی زانێ.
تا ئەوڕۆژەی ،لەخاک دەنرێم
بێجگەلەخۆت، نهێنیمان
کەس نای زانێ....

2007-12-13 هەولێر



## من نەم زانی تۆسەڕابی....

تۆ خۆت وتت،
سێبەرێکم،فەرشی سورم ،
ڕاخستووە،
هەمیشەوەرزم بەهارە،
هەمو دونیا ،
لەچاوانی من ڕا دیارە.

* * *

ئاشنات نەبووم ،!!
لەدورەوەبەهێمنی،
بست بەبستی ، ئەم سێبەرەت،
ئاشنا کردم
ئەشقی دارەسەوزەکانی،
ڕێگای ئەشقی خۆتت کردم...
وەکو سەڕاب،
لەناو چرقەی گەرمای هاوین،
بەنیگایێ کێشت کردم ...
دڵت بردم...
هۆشت بردم...

* * *

فێرت کردم...
نەغمەی بولبول شی کەمەوە

ئاوازی ڕوح،
لەسەر لوتکەی،ئەڤینداری،
بڵێمەوە...

* * *

فێرت کردم،
ئاشقێ بم،
خەمی هەمو دڵدارانی _
ئەم وولاتە،بەکۆڵ دادەم...
تەزوی گەرمی ڕۆحی شیعرم،
وەک پەتو وێ،
بەهەناسە
ساردەکانی،
ئاشقانی وولا ت دادەم...

* * *

ئای لەئەشقت دەریایکە،
سەدان شەپۆڵ،
لەساتێکا بۆم دەهێنێ،
سەدان خەیاڵ،
بەنێو تەزوی ڕوحی شیرین،
دادەهێنێ...
تائەوکاتەی بەد مەست دەبم،
لەئەندێشەی بیری تۆ دا،
بێ هۆش دەبم...

* * *

دەکەومەسەر سینەی خەیاڵ
تا سڕ دەبێ، ئارەزوی دڵ .



تا کاس دەبێ مێشکی جەنجاڵ .
هەر بەڕێوەم...
لەم سەفەرەم،
هەر بەپێ وەم...
بۆلای دارەسەوزەکانی،
بەری ڕێت دێم.
لەهەرکوێ بێ،
وا بەڕێوەم بەدوات دادێم.

* * *

تا وچانێ،
لەژێر باڵای بەرزت بدەم
تاکو کەمێک،
من لەڕازی،
چاوەکانی مەستت بگەم
بەڵام ئەفسوس،
کەگەیشتمەلای هەوارت
خۆم بخزێنمە،
ژێر سێ بەری باڵای چنارت.
تۆ پێت ووتم، ببورەلێم
من دارێکی سەرِابیمە،
بەهەڵەچوی
هەرچی سێ بەربێ من نیمە...
من نیمە...........

هەولێر 2007-12-17

## ئەی میهرەبانی دڵی من

بەیانییەک،
نیگام بەبایەک دەسپێرم،
وەکوهەتاو،
بۆ دیداری تۆ ،دەی نێرم...
تا تێرم کا لەدیدارت.
تاشل دەبم ،
ڕادەمێنم لەڕوخسارت.
ئەی میهرەبانی دڵی من!!
ئەی ئاوازی پڕلای لایەی،
شەوی درێژی بێ کۆتای من...
جەژنانەکەت...
جەژنەکانی تێ کەڵ کردم،
ژوری تاری،
پڕ لەتیشکی هەتاو کردم،
ئەی میهرەبانی دڵی من !!
دەستت گرتم،لەگێژاوی،
قوڵ ترین خەم دەرت هێنام.
دەستت گرتم،لەئارامی،
ئەشقی خۆتت تاراهێنام .
ئەی میهرەبانی دڵی من !!
ناسکترین ئاوازی من ...
ئەی خەندەکەی،
لەخەویشدا،لەلێوی من،
ئەی میهرەبانی دڵی من !!

2007-12-24 هەولێر



## خۆزگەژوانێکت سازدەدا!!

خۆزگەژوانێکت سازدەداو،
ڕێگات دەدام،
ئاگری دڵ ، دامرکێنم ...
عەیامێکە،
تینوێتی لێو لەخەیاڵم
بەلێوی تۆوەدەی شکێنم.
خۆ دەزانم،
تینوێتی من،
هیچ خەیاڵێک،نای شکێنێ
تەنهاجارێک ،ئۆخەیەکیش،
بەنێودڵی ماتی مندا،
دا ناهێنێ ...

* * *

بەڵام گیانە،
دەتۆ ژوانێ سازدەو تابێم
تاتێرلەباوەشت گرم.
تاتێر سەری کوڵمت ماچ کەم
شانۆی خەیاڵ لەبەرچاوی
خۆما،بسرم
زۆر دەترسم،
بشڵێی وەرە،
لەخۆشیانا نەگەمەلات،

لەبەردەرگای
ماڵتان بمرم .!!
بەر دەرگاتان،
بۆ ئەبەدی ببتەماڵم ببتەقەبرم ...

هەولێر 2007 12--26



## ساڵی تازە

کەمی ماوە،
ئاسۆ ساڵی نوێی بتروکێ،
هەتاولەلانەبێ تەدەر
تاریکی شەو ژانی بشکێ.
خۆزگەلەگەڵ،
هەڵ هاتنی یەکەم تیشکێ،
نوێی ئەم ساڵ.
ئاسۆی ناشادی وولاتم،
دەتروکا لێی خەووخەیاڵ.
هەوری ڕەشی دەڕەویەوە،
مەلی ئاشتی دەی دا لەباڵ .

هەولێر 2007-12-31

# نیوەشەوێک

شەو درەنگ بوو،
دواین نامەت گەیشتەدەستم.
کەخوێندمەوە،
نازو سۆزی لێ دەباری،
لەدێڕێکدا،
گوڵی سوری دایەدەستم...
ئەونامەیەی،کەناردبوت
بۆم بەدیاری
لەنامەکەی تۆ دا دیاربوو،
لەنیوەشەوبیرت کردووم،
کەهاتبوی،
لەم سەرمایەدام بپۆشی
تۆ وات زانی بو،من نوستوم...
دیارەگیانە،
تۆ نازانی هەموشەوێ
من بێ دارم جێ ڕاناخەم
پەنجەرەکان دەکەمەوە
دەرگای،ژوریشم داناخەم

ئەگەر هاتی،
بەرەوژوری تەنهایی من،
مەگەڕێ وە،دو دڵ مەبە



لەخەوێکی شیرین دابم...
یان خەیاڵ کەی
ژورەکەی من چراخان بێ
لەباوەشی کەسێک دابم..
بەڵام گیانە
هەرگیز شەوان من ناخەوم
هەرگیز لەخەیاڵ ناکەوم
بڕوا بکە
ئەو کاتانە خەودەم گرێ
لەشەوێکی ساردو سڕی ئەم زستانە،
لەبستێک خاک...
لەباوەشی نەرمت دابم......

هەولێر 2008-1-1

# هەرسا تێک تۆ

هەرساتێک تۆ،
لەگەڵ ڕوحی مندا دەدوێی،
ڕوحم تەنها،ئەوساتانە،
ئارام دەبێ و،دەشنێتەوە...
ئاوازەکان،
تێکەڵ بەڕوحم دەبن و،
نۆتەکانیش،
دەست پێ دەکەن،
مێژوی ئەشقم،لەئەلفەوە
دەنوسنەوە...

* * *

مێژوی ئەشقم،شمشاڵێکە
هەناسەت و،
ووشەکانی
تۆ دەی ژەنن...
ئەوساتانەی،پەنجەکانت
لەژەنینی ئاوازێکدا،ماندو دەبن
گریانێکی پڕهەنسک...
ئاهێکی قوڵ...
حەسرەتێکی بێ کۆتای...
بێ ئارەزووم،
لەنێو مێژوی ئەشقی مندا،



دروست دەبن.
خەمەکانیش وەک ئەستێرە
لەتاریکی شەوی ڕوحی،
من بەردەبن.

2008-1-2 هەولێر

## ڕۆژێ نەبوو

ڕۆژێ نەبوو
دڵ شادم کەی،بڵێم ئۆخەی ،
ئەمڕۆ شادم خۆشەویستم ...
کەدەش زانی،
من دەریایەک،
خۆشەویستیم بەتۆ داوەو،
لەناخەوەش دەت پەرستم ...
بەڵام چی بکەم،
گوێ بەووتەی،
ئەشقی پاکی ... شاعیرێکی،
داماو نادەی ...
ڕێز لەیاسای ئەشق ناگری،
ئەم غروری و،نازوفیزە
زاڵم تاکەی ...

هەولێر   2008-1-9



## مورەت لێم کرد...

مورەت لێم کرد،
یەکەمین جار،!
بەرلەوەی من، جێت بهێڵم،
خۆشت ویستم...
هێندەی نەبرد،
بەپەیامێک،
موژدەی ئەشقت،
دایەدڵ و دایەدەستم ...

منیش وەک تۆ،
دڵم دایەدەستی ئەشق و،
پەیامێکی،
شاعیرانەم،
بەگوێت چرپاند.
سنەوبەری سەوزی ئیشقم،
لەنێو دڵی،
میهری تۆدا ئازیز ڕواند .

تاوام لێ هات،خۆشم ویستی.
خۆش ویستنێک،
پڕبەمانای خۆشەویستی...
پڕ بەمانای، جوانی سروشت

تاشەیدای و،گوڵ پەرستی ...

بەس نازانم،
بۆیەکەم جار،مورەت لێم کرد.؟
لەدوایش دا،خۆشت ویستم ...
وەک پەپولە
تەمەن کورت بوو،ئەشقی ئێمە
بەخەندەوە... بەجێت هێشتم ...
هیواوحەزو، ئارەزوی ژین،
هەموت کوشتم ...
هەموت کوشتم ...

2008-1-10 هەولێر



## بگەڕێوە...

لەو ڕۆژەوەی،
تۆ هەولێرت جێ هێشتو وە.
لێرەدا ناکا تە باران ...
گەڵای ، دارەکانیش وەرین ،
لەم شارەدا،
تازەشادی نابتەمیوا ن ...

کەتۆ دەڕۆی
شەقا مەکانیش، چۆڵ دەبن
شۆستەکانیش،
وەک من مات و، بێ دەنگ دەبن .!!

بۆ من کۆستە
کەئەم شارەجێ دەهێڵی و،
لێ رە دەڕۆی،
کەدێ تەگوێم ووشەی سەفەر،
وا دەزانم خوێنم دەخۆی ...

بگەڕێوەهەناسەکەم
چیتر بەرگەی،
دووریت ناگر م ...
مەحاڵەژین،

بەسەبور ی یادەکانت،
بەسەر بچێ
ڕۆژێ دادێ،
بەکا بوسی یادێ دەمرم ...
بگەڕێوە...
بگەڕێوە...
ڕۆژێ دادێ
بەکابوسی یادێ دەمرم

2008-1-16 هەولێر



## ئەم ئێوارەخۆشەویستی بۆنی خوێنی لێ دەهات!!

ئەم ڕۆ ژیان ،
وەک خۆی نەبو لەبەرچاوم،!!
(هەتاو) وەکو،
ڕۆژانی دی هەڵ نەهات و،
شڵەژابوو کاتێک دەرکەوت ....
ترپەی دڵ م،
وەکو جاران لێی نەدەدا.
چاوەکانم،
وەکو گۆمی خوێن تێ زابوون،
خەیاڵیشم ...
خۆی بەتەنهایی دەسپاردو،
بێ هیوا، دەی ڕوانییە،
هەنگاوەلەنگەکانی ،
ئەم ئێوارەیە.

* * * *

(هەزار ئاخ ئەم ئێوارەیە)
هەتا دەهات،
هەنگاوەکان لەنگ تر دەبوون
ڕێگای خەیاڵ
لەم ئێوارەتەنگ تر دەبوون

نا چاریش بووم...
هەنگاو بنێم ،بڕۆمەپێش .
هەر هەنگاوێک دەڕۆیشتم ،
خۆشەویستی،
بۆنی خوێنی لێ دەهات و،
گوڵی سوری،
بەقەدەری ئەشق دەسپارد...

* * * * *

ئاخ قەدەر،
بەم ئێوارەیە،
ئەبێ بمان ناسێتەوە،؟
کەسوتاوی دەستی ئەوین ..
.ساڵانێکەلەنێو بێشکەی ئەشق داین و
بەحەسرەتی خەوێکی خۆش ،
هەتا ئێستاش هەر زڕخەوین .!!
بڕوا ناکەم،
بڕواناکەم یادی مابێ،!
لەم ئێوارەخوێناویەدا...
بڕواناکەم قەدەربمان ناسێتەوە
بۆ یەئەوها،
هەتادێتن  هەنگاوەکان،
لەنگ تر دەبن
.تارمایەکان تارتر دەبن
ئەو ژوانەی ، هەمو ڕۆژێ
دوباڵندە،



چریکەی خۆشەویستیان ،
لێ دەجریواند .
واچۆڵ دەبن .
وەک ناو لەپی،
فریشتەیەک،لەمەیخانە،
هات بێتەوە...

* * * * * *

لەم  ئێوارەخەماویەدا....
گەرخوا نەبا
کەسێ نەبو
لێ نەگەڕێ خۆر ئاوا بێ ...
لێ نەگەڕێ پێ کی دەستم ،
ڕووەو خواربێ ...
منیش سوژدەم بۆخوابردوو...
(خۆشەویست وئەشق و خۆمم ،
بەئەو سپارد)
ئەویش ئەشقی لا گەورەبوو،
ڕۆژێکی نوێ ی،
لەم ئێوارەژاناویەدا،
بەلێوێ کی پڕ لەخەندەی،
لەگیانی خۆم شیرین تر نارد...
مەیلی خوابوو،
لەتاریکی کەڕۆژ هەڵات
لەتاریکی کەڕۆژ هەڵات

2008-1-21  هەولێر

## ئەی شۆڕەژن...

هەتا دێتن،
خۆشەویستیت زیاتر دەبێ ،
وەکو ئاو بۆسەفەری دوور،
تێنوێتی من دەشکێنی.
ئەی شۆڕەژن.
هەناسەکەی دواین ساتی
ژیانی من ...
پەنجەکانت لەسەر،
تەلی کەمانچەکەهەڵ ناگری و،
هەر ئاوازی گڕ دەژەنی
ماندو نابی... ترپەی دڵم،
بەگۆرانی دەڵێتەوە.
ئەی شۆڕەژن

ئەی شۆڕەژن،
ئەمڕۆ زانیم ،
تۆ چەند گەورەی
لەبەرچاوم....
شیعرەکانم ،
ناتوانن تۆ، پێ ناسەکەن،
باسی ئەشق و،
وەفات بکەن،
ئەی شۆڕەژن

2008-1-22 هەولێر



## خۆزگەئێستاش هەر منالْ بام

منالْینە،
چەند شیرینەدونیای ئێوە،
خۆزگەئێستاش هەرمنالْ بام .
خۆزگەئێستاش وەکو جاران،
تامی خۆلْم بکرد بایە...
خۆزگەهەرگیز
گەورەنەبام .
نەهاتبامە،
کۆڕی خەمی ئەو دونیایە.
* * * *
ئای منالْی،
ئێستاش حەسرەت هەڵ دەکێشم
بۆ تەمەنی بەرائەت و،
بۆ تەمەنی فریشتەیی .
بۆ وو شەی کالْ ،
بۆ ووشەی جوان و پەمەیی ...
بۆ ئەوڕۆژەی
تەنها ( کخەو تەنها بفەم )
لێ دەزانی ...
بۆ ئەوڕۆژەی
شتێ نەبوو لەبەرچاو م ،
تەنها جوانی

بۆ ئەو ڕۆژەی
پێ ڕەوکەبووم
بەلای لایەو سۆزی دایکم
بەمیهری ئەو،
بەگۆرانی گەرمی باوکم

* * *

منا ڵینە
هیوام دەخواست
گەورەنەبام .
هەتا ئێستاش ،
هەرمناڵ بام
نەهاتبامەکۆڕی خەمی ئەو دونیایە.
ئەو دونیایە
پڕ ئاشوب و ،
پڕ جەفایە...
خۆزگەئێستاش هەر مناڵ بام
نەم زانی با
ژیان وایە...

2008-1-23 هەولێر



## تۆ لەڕوحی شیعری مندای

تەنها مەرگەگەربتوانێ،
لەئەشقی تۆ و،
لەناوی تۆم جیا کاتەوە.
پەنجەکانم لێ سڕ بکا و،
پێ نوسەکەم،
لەوەسفی تۆ ... لار کاتەوە...
دڵ تەنگ مەبەگەرجارو بار
قەدەری ژین،
سۆزەی ساردی زریان دێنێ
تۆ لەڕوحی، شیعری من دای
شتێک نیبەگەربتوانێ،
دەرت بێنێ ...
لەهەناسەی ،
گەر می منت ، بستێنێ

2008-1-24 هەولێر

## تا شیعرێکت بۆ دەنوسم ...

خۆشەویستم
تا شیعرێکت بۆ دەنوسم
خوێناوی خۆم دەخۆمەوە.
ووشەووشە،
لەهەناسەم
لەهەست و گیان دەی هۆنمەوە.
بەهەناسەم، قژی خاوی
گشت ووشەکان ، دادەهێنم .
گەردن ئازا، بەخوێنی دڵ
تینوێتی لێوی دەشکێنم .
پەنجەکانم ،
دەکەم بەمۆم
لەنیوەشەو
یەک یەک دایان دەگیرسێنم .
لەنوسینی ناوی تۆ دا،
نەک پیتێکی بپەڕێنم ....
* * * *
خۆشەویستم ،
تاشیعرێکت بۆ دەنوسم
ئاوی چاوم،
وەکو کانی ووشک دەکا .
وەکو باران دا دەبارێ و،
نوکی خامەم ، لێ تەڕ دەکا .



خۆشەویستم،
وادەزانی،
هەتا شیعرێک دێ تەبەرهەم
هەتا شیعرێک، جێ دەهێڵێ
گیان و جەستەم
هیچ سوتان و،
هەڵ قر چانی ناخی ناوێ. ؟
هیچ گریان و ،
هیچ هەنسکی ،
پرحەسرەتی شەوی ناوێ .؟
* * * *
نانا گیانە،
ئاسان نیە،
بەبێ زادەی هیچ مەبەستێک
شیعر بۆ خۆی لەدایک بێ ...
شیعر بۆ خۆی ببارێت و،
بەبێ سەبەب،
ئاوا مەست بێ ...
دەباگیانەوەک هەناسەم
بۆ سییەکان تۆم نەوی ستبا ،
ناوی خۆت و،
وێنەی خۆتت ،
لەنێو دێڕی شیعرەکانم ،
ئەو جا دیبا ...
ئەو جا دیبا...

31--1 2008 هەولێر

## خۆبەئەنقەست بۆتۆ ناگریم

گریانی من ئەنقەست نییە
ئەشقی تۆیەدەم گرێـنـێ
هــەناســەی تــۆژیانمــە
ئـاســودەی بۆمــن دێـنێ

خەیاڵ نەکەی گەربتوانم
بێ هەناسەت ئەمن بژیـم
لـەدوری تـۆمــن نـازانـم
ئازیزەکەم کەخۆشم چیم

هەر بەهیوام ڕ ۆژێ دابێ
هەناسەمان تێکەڵ یەک کەین
خۆشەویستی بۆ حەرامە
بێ زەییانە باجی بدەین

دڵ نـیـابـەکــەنـاتوانـم
لـەبـیـرت کەم لەم ژیانـە
گەر باجەکەی مردنیـش بێ
بێ دوو دڵی لام هەرهـەرزانە

2008-2-1 هەولێر



## بۆچی هاتی 2

ساڵانێک بو،
دەرگای دڵم ،
دا خستبو لەدڵداری...
ئەتۆهاتی توشت کردم
ئەتۆهاتی،
لەڕابردوو... زۆرخراتر،
توشی داوی ئەشقت کردم
منت خستەدەریای خەم و،
خەمی دونیات ئاشنا کردم .
هەربزانە، خەمێکی تۆ
جەستەو ڕوحی،
بەچرکەیەک
جییا کردم ....

2008-2-3 هەولێر

# ڤالان تاین ...

ئەم ڕۆ جەژنی ئاشقانە
هانێ دڵم بۆ یاد گار ی
تۆ کە لە گوڵ جوانتری
گوڵ چۆن بێنم بۆت بەدیاری

شەرم دەکا گوڵی سوریش
لەبەر دەمت سەر هەڵ برێ
تیشکی چاوی پڕ لەنازت
بەندی دڵی منیش دەبڕێ

من لە ڕۆژی ڤالان تاین
هانێ ڕوحت پێشکەش دەکەم
ئەتۆش لێوت بۆمن بێنە
من جەژنانەت لەلێودەکەم

2008-2-14 هەولێر



# پەیامێک لەغوربەتەوە...

گەرپەیامێک لەدورەوە،
نەک لەووڵات،
لەغەریبی
هەرلەودیوی سنورەوە
بێ توبڵێ،
خۆشم دەوێ ی
بێ توبڵێ،
واهاتوم وبۆنت دەکەم
واهاتوم و،بەولێوانەی
ماوەیەکەتۆزی غوربەت،
لەڕوخساری دا نیشتو وە
ما چت دەکەم .
چی پێ دەڵێی،
لێ دەگەڕێ ی،
بۆنت بکا. ؟؟
لێ دەگەڕێ ی،
بەولێوەتۆزاویانەوە
ماچت بکا. ؟؟

* * * *

ئازیزەکەم،
ئای لەتامی تاڵی غوبەت
ئای لەئەشقت،

لەئەندێشەی بیری تۆدا،
دەم خوا خەفەت .
ئای لەغوبەت
ئای لەدوریت،
ئاخ بۆبۆنێک لەزوڵفت و،
ئاخ بۆماچێک لەلێوت و،
بۆ وچانێ ،لەسێبەری
بەژن و باڵات
بۆپیاسایەک ...
لەهەرشوێنێک گرنگ نییە
بەس لەووڵات...
نەک لەغوربەت
بەس لەووڵات...

2008-2-14 سوریا... هەولێر



## بەڵێنێک

بەڵێن وابوو،
ئەمڕۆئازیز...
خۆمن و تۆ،
لەژوانێک دا بەیەک بگەین .
ووشەی ئەشق و، خۆشەویستی
لەزیندانی سینەماندا...
ئازاد بکەین .
چاوەڕێ بووم، هەرچۆنێک بێ
پەیامێکم،
لەدەستی تۆ وەپێ بگا...
چاوەڕێ بووم، هەواڵێکت
ماڵی چۆڵی دڵێکی شێت،
ئاسو دەکا...
چاوەڕێ بووم، تائێوارە
تابارانیش...
هەموگیانی لێ تەڕکردم.
تاتاریکی شاری داپۆشت
ئاسۆی لەچاو،
لێڵ تر کردم.

* * * *

هیچم نەبیست،
چ بخەمەئەستۆی قەدەر،
کەنەهاتی،

بم دووێنی ...
کەنەهاتی،
گوڵی سووری خۆشەویستی
لەم ژوانەدا،
بەماچێکت بنەخشێنی.

2008-2-18 هەولێر



## ئازیزەکەم ئێستا لەکوێ ی

ئێستالەکوێ ی،
هیچ هەواڵێکت نازانم ،
نازانم کوێت بۆبگەڕێم .
ئازیزەکەم،
بەدوای تۆ دا من بۆ کوێ بێم ...
لەبیرتەلەشیعرێکدا ،
بۆم نوسی بووی،
نەکەی ئازیز خۆت لێم ونکەی
شارەوشارت بۆبگەڕێم .
داخێک بنێی بەجەرگمەوە،
چاوەڕێ بم هەربڵێی دێم .
ئێستا گیانەلەبرِی هاتن
واچەند ڕۆژەونم کردوی .!
واچەند ڕۆژەلەخەیاڵم
هەمودونیام لەدوکردوی .
وەک گەڕیدە،
بست بەبستی ،
ئەم وولاتەدەپشکنم
بۆکێ دەچم نات دۆزمەوە،
خۆشم وونم.
چ دەر دێکە،
لێک دابڕان.

کەوا ون بوی نات دۆزمەوە...
هەموشەوی ،
لەگەڵ ڕوحی شیعرەکانم ،
پێکی خوێناو دەخۆمەوە.
دەبمەمۆمێک،
لەهەشمەتان دەتوێمەوە.
دەوەرەوە،
ئێستا لەکوێ ی،
کوێت بۆ بگەڕێم ،
بت دۆزمەوە...

2008-2-26  هەولێر



## ئەوشەوەی شیعر لێم یاخی بوو!!

ئەمشەو، ویستم
وەکو شەوان،
شیعرێک بۆجوانیت بنوو سم .
فەرهەنگەکان ...
کۆکەمەوە،
بۆ ووشەیەک،شایستەت بێ.
بۆت بی نوسم...
تاپێم بکرێ،
کڕنۆش ببەم بەووشەکان
لەناخەوە،
لەنوسینی ناوی تۆ دا،
وەکو جاران،
بێمەگریان ...
بەڵام لەپڕ،
ڕوحی شیعرم لێ یاخی بوو!
هەرگیز ئیدیای، شیعری خۆمم ،
بەرامبەرت وا نەدی بوو!
تکام لێی کرد ...
ڕێگای نەدام ،
لەهیچ دێرێک ناوت بێنم
ووشەی ناسک وەک پەڕەی گوڵ
بەسەرت دا بباریێنم . !

سەرم سوڕما ...
لەهەناسەو،
لەلێدانی ترپەی دڵی،
شیعری ئەم شەو.
لەئاوزینگی، ووشەکانی،
دوای نیوەشەو...
سەرم سوڕما...
بۆچی شیعرم لێ یاخییەو،
لێ ناگەڕێ ناوت بێنم .
پەنجەرەم لێ، ناکاتەوە،
لەودیو پەردە،
تابت بینم ...
من نەم زانی،
شیعرم هەستی،
بەدڵ ڕەقی و،
بێ وەفایی تۆکردو وە..
هەموڕۆژێ ،
شوشەی دڵی ووشەکانیت،
شکاندو وە...
بۆیەئەویش لێم یاخییەو،
ڕێگام نادا،ناوت بێنم .
وەکوجاران،
لەداستانی خۆشەویستیم
بت ناسێنم .

هەولێر 2008-3-12



## بۆجوانێکی ئەشق کوژ...

پەشیمانم خۆشم ویستی
هەزارکەڕەت پەشیمانم
هەرلەوساتەی ئەتۆم خۆش ویست
تائێستاش چاو بەگریانم
بڕوام نەبوو ڕۆژێ دابێ
من پێت بڵێم لێم دورکەوە
چونکەزۆرم خۆش دەویستی
زیاتر لەواتای ئەشقەوە
خوادەزانێ سەبوریم بووی
هەموگیانی من هی تۆبوو
ئەوساتانەدڵ شاد دەبووم
کەگوێ چکەم پڕ دەنگی تۆ بوو
بەڵام ئێستا پەشیمانم
لەدوای ئەوەی زانیم کەتۆ
جەستەوڕوحم لەخاچ دەدەی
بەئەشقێکی پڕ لەدرۆ
لەوڕۆژەوەی تۆ م ناسیوە
قسەوناخت زۆرلێک دوورن
دەست لەملانێی یەکترنابن
چەشنی باکورو باشورن
دەئێستاکەیاخەم بەردە
دەبابۆخۆم با تەنها بم

خەمەکان با بم خۆنەوە
باوابزانن من شەڕابم
لەدوای ئەوەی لەنێو دڵم
بەبوکێنی بەڕێم کردی
شیعرەکانم پرسەیانە
چونکەدەزانن تۆ مردی

2008-3-19 هەولێر



## کەبیر لەدوریت دەکەمەوە...

گەلێ جاران،
بیر لەدوریت دەکەمەوە،
تاتۆقی سەر،
نوقمی خەم و، گریان دەبم .!
هێز ئەژنۆکانم جێ دێڵن،
لەسوچێکی ژورەکەمدا،
لەگەڵ بیرم نەبان دەبم...
کەهەناسەش،
بۆ دوری تۆ هەڵ دەکێشم،
خوادەیزانێ،
بەس مەبەستم دیدارتە
ئاودانەوەی، ڕوحێکی سیس...
گەڕانەوەی،
هەست و سۆزی جارانتە...
کەدێیتەوەش...
بەناو وەکو برۆ و برژانگ،
لەچاوانم نزیک دەبی.
بۆیەک چرکەی دیداریشت
وەکومەودای،
زەوی و ئاسمان
لێم دور دەبی ...
ماڵ بەماڵی هەولێریشت
بۆ بگەڕێم ...

نات دۆزمەو،
هەر ون دەبی...
ئەی ئەوکەسەی
گوڵی عومرت لێ ژاکاندم ...
ئەی ئەوکەسەی،
هەناسەشت،
لەسینەدا لێ تاساندم...

2008-3-20 هەولێر



## کە پێم گوتی...

کەپێم گوتی بەسەئیتر،
بانێوانمان کۆتایی بێ ،!
کۆتو بەندی ئەوئەشقەی تۆ،
لەنێودڵم بادوایی بێ،
گریانەکەت، ڕێگای نەدام
واز لەئەشقی تۆبهێنم ...
مەملەکەتێک دوورکەومەوەو،
شانۆی خەیاڵ بسوتێنم ...!
من دەم زانی تۆئاڵودەی،
تلیاکی دوو لێوتم دەکەی...
بەخەیاڵیش پێم بکێشی،
ڕۆژێ دادێ بێ ویم دەکەی.
ئەی بۆئێستا بۆجارێکیش،
لەویژدانی خۆت ناپرسی،؟؟
چۆن دڵێکت لەخەم ڕزاند،
لەژێرناوی خۆشەویستی...

2008-3-21 هەولێر

# بێ تۆمن چیم...

بێ تۆگیانە،
لاشەیەکی ساردو سڕم،
خەمی دونیام لێ دەئاڵێ ...
دەریایەکی،
سەر شێتم و،
کەس بەمەندیم دا،
هەڵ ناڵێ ...
بڕوابکە،
چرکەیەکیش بێ تۆ ناژییم
هۆگیانەکەم،
گوڵی ماڵێ ...

هەولێر 2008-3-22



# پێ نوسەکەم پەنجەکانم دەتەزێنێ !!

چەند ڕۆژێکەپێنوسەکەم،
دەڵێی بەفری زستانێکی ساردوسڕە،
کەدەی گرم ...
پەنجەکانم دەتەزێنێ . !!
خوێن لەلاشەی دا مەییوەو،
دڵۆپێکی دانا بارێ ،
تادەفتەری شیعرەکانم ...
وەکو پێشتر بنەخشێنێ .

* * *

شێتم دەکا پێنوسەکەم،
ئەگەر ئەویش،
هەر وەکو ئەو بەجێم بێڵێ و،
چیترنێتەوەنێو دەستم ...
چیترخوێنی لێ نەبارێ،
لەنوسینی شیعرو هەستم...
دەریایەک بۆم تەزی نەکا
لەمەبەستی،
نێو هەڵ بەستم ...
من دڵ نیام،
نەک بەتەنها شیعرەکانم،
باغی ژینم لێ چۆڵ دەکەن،
جەستەش لەڕوح بەتاڵ دەبێ _
وەک ناو لەپ و بەری دەستم...

هەولێر 2008-3-22

## تەریقەت

تەریقەتم داوەدەست شێخ
واڕوم کردەتەکیەکەی تۆ
من بۆئەشقت زکر دەکەم
لەهەناسەم دێتەدەرسۆ
دەستم دامێنی نازت بێ
دڵی دەروێشت مەشکێنە
ئەوزەرگەی من لەتۆم وەرگرت
دەسەیری کەهەموی خوێنە
خوێنی دڵی داماوێکە
تەریقەتم لێ مەستێنە

2008-3-24  هەولێر



## هەولێرەکەم

هەولێرەکەم،
هەرچەند دوورم،
بەڵام بۆنت هەردێتەلام.!
شێوەت هەرگیز،
وەک تابلۆیەک،
لاناکەوێ لەپێش نیگام.!
کەدوردەبم هەولێرەکەم،
بڕوابکە...
ئەتۆم زیاد خۆشتر دەوێ
زیاترخوێنم بۆت دێتەجۆش،
ئەتۆم دەوێ...
هەولێرەکەم، سوێند بەقەڵا
سوێندبەباڵای، بەرزی منارە...
سوێند بەهەمو ،پیرۆزییەک
کەلەچاوی... مێژووت دیارە...
قەت ناتوانم بەجێت بێڵم،
قەت ناتوانم شەکری لێوت
بەغوربەت و،بەنامۆیی،
بسپێرم...
بۆیەهەولێر کەناوت دێ
ئارامییەک،
هەموگیانی من دادەگرێ،

ڕێگای سنورم لێ دەگرێ...
بۆیەهەرگیز من ناتوانم،
بەیەک جاری بەجێت بێڵم.
دڵ نیابەجێت ناهێڵم
هەولێرەکەم
بوکی مێژووی وولاتەکەم...

2008-4-4 سلێمانی



## توخواهاوڕێ

چەندەئەشقێکی بەسوێیە،
هاوڕێ یەکەم،
تۆپێم دەڵێی،
خەم دای گرتوی .
چ ئەشقێکەدڵی بردوی ...
هاوڕێیەکەم...
تۆتائێستا،
ژانی ئەشقت لێ نەبو وە
تاکوئێستا پەپولەی تۆ
لەهیچ گوڵێک نەنیشتو وە.
بۆیەهاوڕێ تکادەکەم،
ڕێگام مەگرە،
بۆشیوەنی دەردی دوری
ڕێگا بدەبەگریانم
تەنهائەوەبۆم سەبوری
هاوڕێ یەکەم،تۆنازانی
کەئەو دەرکەوت...
قەسەم بەخوا،
هەتاو هەڵات خۆی حەشاردا
شەرمی دەکرد،
لەحزوری دەرکەوێتن،

پەچەی دادا...
هاوڕێ یەکەم،
چیت بۆ باسکەم
بڕوابکەزمان لاڵەلەوەسفی ئەو
چاوهەڵ نەهات لەشەوقی ئەو
بڕوابکەکاتێ دەرکەوت
بۆنی گوڵی هەمودونیالەئەودەهات
بەقەدسروشت،
نازلەلەنجەی دادەباری،
وەک باران بو،
بەسەر ڕوحی من داباری...
بۆیەهاوڕێ
تکادەکەم ڕێگام مەگرە
بابسوتێم هەر بەوگڕە
تکادەکەم ڕێگام مەگرە
2008-4-10 هەولێر



## ببورەلێم

ببورەلێم
هەندێ جاران،لێرەولەوێ،
بەبێ وەفا ناوم بردوی .!
مەڕەنجێ لێم هەناسەکەم،
لەخەفەتی،
دەردی دوری وام پێ گوتوی.!
دەناگیانەخۆ ناتوانم،
بەبێت بژیم،
بۆیەک چرکەش لەبیرت کەم .
خۆناتوانم بەبێتۆمن،
بەئاستەمیش،
لەم ژییانەهەناسەبەم...
ببورەلێم بەزمانی لاڵ،
بۆجارێکیش،
گەر وتبم ، تۆبێوەفای.
گەروتبم،لەم ژیانە
بۆمن دەردو،
دەردەسەری و،ژان و جەفای...
ببورەلێم ئێستا زانیم
وەفات بۆمن،
ئاسمانێکەپڕ ئەستێرە...
میهرەبانی وانەخوێنە،

لەنێو دڵت،
میهری خۆتی پێ بسپێرە.
ئازیزەکەم من دەم زانی،
ڕۆژێ دادێ،
وەفاوبەڵێن دێنیتەسەر.
لێ ناگەڕێی ماچی لێوت،
لەسەردڵم،
تاهەتایەببتەکەسەر...
بۆیەمنیش هەتا ماوم ،
لەم ژییانە،
بەبێ وەفا ناوت نابەم
لەهەرکوێیەک نازێکت کرد،
پەردەی ڕوحم،
بەڕوخساری نازت دادەم....

هەولێر 2008 4--11



## وێنەکەت

واچەند ڕۆژەوەکو شێتێک
لەوێنەکەت ڕادەمێنم
ژانی دڵم بەدید اری
وێنەکەی تۆ دەشکێنم
ئای کەجوانەلەوێنەکەت
جوتێ چاو و زوڵفی خاوت
چ ناسکەلێوی تەڕی
بەخوناوت وەکوناوت
خۆزگەچاوت لەوێنەکەت
وەک یەکەم جاردەی دواندم
بەئاستەمێک بەشەرمەوە
چاوێکی لێ دەنوقاندم
خۆزگەلێوت لەوێنەکەت
وەک یەکەم جار دەی دواندم
لێوێکی پڕ لەخەندەی بۆ
بەشەرمەوەئەجولاندم
ئەوساگیانەدڵەی شێتم
لەدیاروێنەت ئارام دەبوو
لەدیداری وێنەکەی تۆ
بۆیەک چرکەگەرتێردەبوو
هەتاچاوت نەنوقێنی
هەرلەوێنەت ڕادەمێنم
یالەدیاری خۆم کوێردەکەم
یان فرمێسکم دەبار ێنم

هەولێر 2008-4-11

## بێ تۆدەمرم

نەکەی ڕۆژێ بەجێم بێڵی،
ماڵی دڵم ساردو سڕ کەی.
ئەوبەڵێنەی کەپێت داوم
وەکونوشتی،
لای ساحیرێ بەتاڵی کەی.
ئاگاداربە،
ئەودونیایەی ئێمەتێیداین
مانای ئەشق،
کەس نای زانێ...
هەر ڕۆژەوئاشقێ دەکوژن
هەموی دەڵێ،
ئەوەی ئەشق دەکوژێ کوانێ

2008-4-12 هەولێر



## مەمگۆڕەوەبەکەسێکی...

نەکەی،
ئەشقی پاکی دڵم،بدۆڕێنی
بەکەسێکم بگۆڕیەوە
وەکوپایز،
گەڵاگەڵابت وەرێنی ...
واتێبگەی بەهەشتەئەو،
ئاواتت بۆ بەدی دێنی .
دونیاوەکو بەهارلێ کا،
لەدوایی دا،
لەزەڵکاوی تاوانێکدا،
بت خنکێنی ...
ئاخرگوڵم،
ئەم سەدەیەزەمانێکە
بەکلکی فێڵ ڕاوەستاوە
نەک بەتەنها،
دڵ سادەیەکی وەکو تۆ،
زۆری وەک تۆ،
لەم زەمانە
فێڵەکڵاوی لەسەرناوە...

2008-4-12 هەولێر

# ئاوێنەکەم

نیوەڕۆیەو،
تەنها من وئاوێنەکەم
لەژورێک داین .
هۆردوکیشمان،
سەیری شێوەی یەکتردەکەین .
لەڕوخساری ئاوێنەکەم
خەمێکی قوڵ دەخوێنمەوەو،
زوڵفی سپیم شانەدەکەم ...
ئاوێنەکەم کەوتەپرسیار
نەک پرسیارێ،
سەدان پرسیار...
ئەوپێی گوتم،
بۆلەڕوخسار پەشۆکاوی،؟
بۆ بێ هێزی؟
بۆداماوی ؟
نەم دەزانی چی وەڵامی
ئاوێنەکەم بدەمەوە
پەردەلەسەر، کامەبرین
لەم ساتەدا هەڵ دەمەوە
تەنها ووتم ئاوێنەکەم،
توجوانی خۆت مەژاکێ پێم
توجوانی خۆت لەمن گەڕێ ...



خوێنێکی نوێ،
لەدەماری مندا تازە،
قەت ناگەڕێ...
لەمن گەڕێ
باتەنها من... بتوێمەوە
لەم ئەشقەدا بڕزێمەوە...

هەولێر 2008-4-13

## لەدوای ئەوەی خۆشم ویستی

وام لێ مەکەبەگومان بم
لەو ئەشقەی تۆپەشیمان بم
هەرگیزئەشق ئاوانابێ
هەمودەم چاو بەگریان بم

بەئەشقەوەخۆشم ویستی
دڵی خۆمم دایەدەستی
سەبەب چییەبۆئازارم
دیارەبەئازارم مەستی

ئازارم دەی یاخود نەم دەی
بەسوتانم بکەی ئۆخەی
بەتەنهاتۆم خۆش ویستوە
گەروەکونەی شینم پێ بکەی

دڵم نایەدوعات لێ کەم
دوعاش بکەم بۆتۆی دەکەم
لەعومری من خودا هەڵ گرێ
ئەویش پێشکەش بەتۆ دەکەم

2008-4-13 هەولێر



## تەمەنێک ...

تەمەنێکم،
بەخشی بەچاوەڕ وانی تۆ،
هەرنەهاتی بت دوێنم.
هەرنەهاتی بەئارەزوم،
ئەوئارەزوەی خۆشت هەتە—
لەباوەشم بت خەوێنم .
وەرەگیانە،
شتێ نیەناخۆش تربێ،
لەبێ تۆی و چاوەڕوانی .
شتێ نییەدڵ خۆشم کا،
جگەلەتۆ،
بەڕوحم بڵێ، گۆرانی .
وەرەگیانە،
هەناسەکەی کامەرانی،
وەرەگیانە،
بۆماڵی چۆڵی دڵی من،
ئاوەدانی .
وەرەگیانە
گیانی گیانی

2008-2-13 هەولێر

## دەزانم تاڵە

لەمن مەگرە گەرجارو بار
لەگەڵتدا،
وەکوشێتێک قسەدەکەم
بەبێ پەروا لەحزورت
ووشەی زۆرتاڵ پەڕەدەکەم
ئاخر گیانەتۆنازانی
هێندەی چاوم،
هێندەی سروشت ...
خۆشم دەوێی...
وەک هەناسە،
بۆسییەکان پێویستمی .
من دەمەوێی...
کەدێمەگۆ لەگەڵ تۆدا
تۆدەزانی بۆوەک باران دادەبارم ،؟
کەدڵیشم بۆتۆچەترە،
تەڕت دەکەم بەس ناچارم .؟
باپێت بڵێم،
ئەی خەندەکەی سەرلێوی من
ئەی ئەوکەسەی،
بۆیەک چرکەش
لاناکەوی لەچاوی من ...
باش بزانە، من نامەوێ



تۆزو گەردی ئەم زەمانە
بنیشێتەبەژن وبالآت .
ڕەشەبایەک هەڵ بکات و،
فو بکاتەچرای سۆ مات.
باوانەکەم، دەبزانە
ئەوەترسی دڵی منە
ئەوەئەشق و،
ئەوەوەفاو،
سۆزی منە...

2008-4-14 هەولێر

## بەساقەتبم ...

بەڵێنت دا زوبێیتەوە،
پەلەبکە،لەهاتنەوەت
چاوەڕێمە،
بەساقەتبم .
چاوەڕوانی زۆرناخۆشە،
من دڵ نیام،هەردەم کوژێ
تاکەی ئاوا،
پڕخەفەت بم .
خۆدەزانم هەردێیتەوە،
ڕوحی شیرین بۆشارەکەم
ئەوبەڵێنە،
بەجێ دێنی .
بەس دەترسم ئەم جارەیان،
ترسێک دڵی داگیر کردوم
شوشەی دڵم،
بشکێنی .
سۆمای چاوەکانم لێڵ کەی،
ئەوبیناییەکزەی ماوە
ئەویشم لێ،
بستێنی .
دەوەرەوەهەرچاوەڕێم،
ئێشک دەگرم تادێیتەوە



سەدجاری تر،
بەساقەت بم .
بەس دیداری تۆم مەبەستە،
گرنگ نییەچ ڕودەدا
سەد هێندەی تر،
پڕخەفە ت بم .

2008-4-17 هەولێر

## بەرلەڕۆین بێ گیانم کە

گەربەنیازی جێم بهێڵی
بەم شێوەیە،
ڕێگات نادەم ،!
بەرلەڕۆین بێ گیانم کە...
بەرلەڕۆین،
چەقۆ بێنەو،
دڵم دەرکە...
لەسەردەستی خۆتی دانێ و،
بەئەسپایی تەماشای کە...
دەبزانە،
ئەو وێنەیەی،
خۆت پێت داوە،
بەمردویش ئامادەیەبت داتەوە؟
تەماشای کە،
ناوت لەکوێ هەڵ کەندراوە
،بەچ پیتێک لێی نوسراوە
هێزی دونیا کۆبکەوە
بابتوانێ...
ئەوناوەی تۆ،
ڕەش کاتەوە...
بەم شێوەیەڕێگات دەدەم
بەرلەڕۆین بێ گیانم کە...

2008-4-21 هەولێر



## چاوەڕێ بووم...

لەسپێدەوە،
پاسەوانی بەردەرگاتم،
چاوەڕوانی یەک نیگاتم.
لەسپێدەوە،
دارەکانی بەردەرگاتان،
وێنەم دەگرن،
ورتەیەکیان لێوەنایە...
کەهاتیەدەر،
سەیرێکیان کەو،
بزانەچەند،
وێنەی ماتی منیان لایە...

2008-4-21 هەولێر

## خەیاڵ نەکەی لێم ون نابی

تۆلەکوێ بی،
دڵ نییابە،
دڵی شێتی من لەوێ یە...
هەرووشەیەک،
لەبەرخۆتا دەی درکێنی،
وەک ترپەی دڵ،
ئاگام لێ یە...
وامەزانەکەلێت دوورم،
ڕوخساری تۆم ون کردو و ە.
هەرچەند جاری چاوەکانت ،
دەتروکێنی ،
بەقەدخۆیان
وشەی شیعریان... بۆم ناردووە...

❊ ❊ ❊ ❊

بۆیەئازیز،
خەیاڵ نەکەی لێم ون نابی
قەت لەڕوحی شیعرەکانم جودانابی
تۆلەکوێ بی دڵ نییابە
دڵی شێتی من لەوێ یە.
هەرووشەیەک،
لەبەرخۆشت بی درکێنی،
وەکو، کێشی شیعرەکانم ،
ئاگام لێ یە...

هەولێر 2008-4-22



## ترسم هەیە...

لەبێ دەنگیت،
ترسم هەیە،
منت لەبیر چوبێتەوە...
ترسم هەیە...
ئەوشیعرانەی بۆم ناردبووی
لەنێو دڵت دانەمابن،
لەیادت دا سڕیبێتەوە...
خۆمن لەگوڵ،
گران ترم پێ نەگوتوی،
من نازانم
تۆڵەی چیم لێ دەکەیتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊

هەناسەکەم،
بەسەئیتر بێ تاقەت بووم ،
ئەوبێ دەنگییە، زوبشکێنە...
گەرناگیانە
گڕلەجەستەی،
منیش بەردە....
بەس بەتەنها
شیعرەکانم،مەسوتێنە....

هەولێر 2008-4-23

## مەچۆڕەوە...

مەچۆڕەوە،
هەولێر ڕەنگی تۆی گرتووە.!
تۆدەزانی لەوڕۆژەوەی،
تۆلێرەنی .
چاوم ڕەنگی ون کردو وە. ؟
بەهاتنەوەت چاوەکانم،
ڕەنگیان هاتۆتەوەسۆما.!
ماوەیەکە،
لەبێ ڕەنگیت هێند کزبو وە،
پێی نابینم ژێر پێی خۆما...
تکادەکەم مەچۆڕەوە،
بائەم شارەچیتربێ تۆ،
بێ ڕەنگ نەبێ...
دڵی منیش،
هەمو دەمێ لەبێ تۆیی،
وا تەنگ نەبێ ...
مەچۆڕەوە،
هەولێر ڕەنگی تۆی گرتووە
لەوڕۆژەوەی،تۆلێرەنی
هەرچی ڕەنگی دونیا هەیە
چاوەکانم ،
ونی کردووە...

هەولێر 2008-4-25



## برای شیرین ئەم سەفەرەت بەرەوژورکە

تۆش ڕۆیشتی،
بەجێت هێشتم ...
تۆش ئەم کۆچەت کردەڕاستی و،
هیوات بەغوربەت، پێ نێشتم ...

ساڵانێکە...
ناوی غوربەت ... کەدێتەگوێم
خوێناوم پێ دەخواتەوە.
دەستی لەرزۆکم پێی ناکرێ
یاخەی مێژوو ... بکاتەوە.

تۆچیت داوەلەم سەفەرە،
بگەڕێوە...
تامی غوربەت ، گەلێ تاڵە.
وەنەوزێکی تێدا نییە...
ڕاستی کوژە، بەس خەیاڵە.

بگەڕێوە...
ئەم سەفەرە، بەرەوژور کە،
بەهاتنەوەت شاری چۆڵم،
پڕ لەگوڵی جوان و،سورکە...

بگەڕێوە...
بەرگەی هیچ خەمێک ناگرم ...
باوەڕناکەم ئەم جارەیان
بت بینمەوە،
بەوژانەوەئەمن دەمرم ...

بگەڕێوە...
ئەم سەفەرەبەرەوژورکە
هێزی ئەژنۆم، لێ مەشکێنە،
تف لەغوربەت...
دەتف لەودیوی سنورکە
ئەم سەفەرەبەرەوژورکە....

2008-4-25 هەولێر



## نامە ت نایە ...

ماوە یە کە نامە یە کت بۆنە وایم نە ناردووە
نە ورتە یێ نە شیعرێکم لە لێوی تۆنە بیستووە
ماوە ماوە هۆنراوە کت بە نامە یە ک بۆمن دە نارد
هە رچی سۆزوجوانی هە بووبە ونامە یە ت ڕادە سپارد
هۆنراوە کان بە بێ دە نگی بە بێ چرپە دە هاتنە لام
لێوە کانیان ماچ دە کردم ئە گە رهاتوولە خە ویش بام
سە رسام ماوم کە چی ئێستانامە یە کت بۆمن نایە
خۆدە ش زانم سە دان نامە ی زە ردوسورت لە دڵ دایە
ترسم هە یە لە دێرێکی هۆنراوە یە کم تۆرابی
دە ناگیانە خۆشە ویستی بە بێ نامە هە رگیز نابی

2008-4-24 هەولێر